# برایەتی

# دینــــی


نوسینی

ئەبو سەعدی ئەسەری

وەرگێڕانی

ئازاد نجم الدین




ناوی کتێب بە عەرەبی: الأخــوة الدينيـة
نــاوی نوســـەر: ئەبو سەعدی ئەسەری .
نــاوی کـــتێب : برایەتـی دینــی
ناوی وەرگـــێڕ: ئـازاد نجم الدیـن
نەخشەسازی ناوەوە: شـنۆ حمـدامیـن
خـــــەت : نـەوزاد کۆیـی
بـــــەرگ: ئەمین موخلص
بڵاوکردنـــەوەی: نوســینگەی تەفــسیر بــۆ بڵاوکردنـــەوەو ڕاگەیاندن .
نۆرەو ساڵی چــاپ: یەکەم ١٤٣٠ك – ٢٠٠٩ ز
تــیـــراژ : ١٥٠٠ دانـە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (١٩٢٥) ی ساڵی ٢٠٠٨ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٦٠ ٤٦ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ . وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ.

يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزاً عَظيماً

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصْدَقَ الحَديث كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمدٍ ﷺ وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ

**پێشکەشە**

بەو موسوڵمانانەی بە هەستی برایەتی دینیــی ڕیــزی موسوڵمانان دەکەنە دیواری خشتی خشت.

ئازاد نجم الدين

# پێشەکی

## برایەتی دینیی

الحمد لله رب العالمين، وأفضل الصلوات والتبريكات على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين

پەیوەندی برایەتی دینیی، هەستێکی ناسکی لوتفی خواییە، ئەو پەیوەستیەیە، کە دڵەکان بە یەکەوە ڕیزبەند دەکات، ئەو نورەیە، کە بە ساف و ڕونی ڕۆحە پاکەکاندا گوزەر دەکات و پێکیانەوە دەبەستێتەوە...

با لەبەر ڕۆشنایی دەقە پیرۆزەکانی وەحی خوادا کۆڕێك بۆ برایەتی دینیمان بگرین، تا قەدری ئەو یەکبون و ئاوێتەییە بزانین، کە لەبەر خاتری خوا دەکرێت، تا ماف و ئەرکەکانی برایەتی دینیی بۆ هەموو لایەك ڕون ببێتەوە، تا بزانین چۆن ڕەفتار لەگەڵ هاودینانی خۆماندا بکەین...

# بەشی یەکەم

## (١)

## چەمکی برایەتی دینیی

### ١ـ برایەتی دینیی لە بەردەوامی خۆشەویستی خوای گەورەوەیە:

پەیوەندی برایەتی دینیی بە ئایەتی قورئانی پیرۆزەوە چەسپاوە، چونکە خوای گەورە دەرهەقی فەرمویەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾ الحجرات/١٠ واتە: (موسوڵمانان جگە لە برای یەکتری هیچی یەکتری نین...) کەوابوو پێش هەموو شتێك، دەبێ ئەمە لە قەناعەتی دڵ و هەست و هۆشی بیرو ژیرییدا بچەسپێت، کە برایەتی دینیی گرێبەندێکە خوای پەروەردگار بۆ بە یەکەوەبەستنی موسوڵمانان فەرمانی پێ کردووە، بۆیە هەر دەبێ لەبەر خاتری ئەو و لە پێناوی ئەویشدا بێت، چونکە بەردەوامبونی خۆشەویستی خوای گەورەو یەکخواپەرستنە، لەبەر ئەوەی خۆشویستن و سەرخستنی موسوڵمان لە خۆشویستن و سەرخستنی دینیی خواوەیە، ئەو کەسەی خوای گەورەی خۆش دەوێت، حەتمەن هەمو ئەوانەشی خۆش دەوێت و، کە خوایان خۆش دەوێت ئەوانەی، کە خوای گەورە خۆشی دەوێن، ئاخر لەم ڕوانگەوەیە، کە هەموو پێغەمبەران و شەهیدان و پیاوچاکانیشی خۆش دەوێن...

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾ التوبە/٧١ واتە: (موسوڵمانان پیاوو ژنیان هەندێکیان سەرپەرشتیارانی ئەوانی تریانن...) هەر ئاوا بە شێوەیەکی گشتی: (هەندێکیان سەرپەرشتیارانی ئەوانی تریانن) بۆ ئەوەی دەروازەیەکی پڕ خێرو فەڕ لەبەر دەم هەموو موسوڵمانێکدا بەرامبەر هەموو

موسڵمانانی تر لە هەموو سەر زەمیندا بکاتەوە... چ هەستێکی بەرزە، کە هەست کەین موسوڵمانان لەهەر وڵاتێکی ئەم سەر زەمینە بن، لەهەر گەل و میللەتێك بن، بە هەر زمانێك بدوێن! مادام ئەهلی ئەم دینەن و بەم تەوحیدی خواناسییەوە پابەندن کە خوای گەورە بۆی ڕون کردوینەتەوە، هەموویان برامانن! ئەو ماف و ئەرکەی ئێمە هەمانەو لەسەرمانە بۆ ئەوانیشە... ئەوانیش هەیانەو لەسەرنی!!

برایەتی دینیی بەربەستی دنیایی نایاتە ڕێ، هەر وەکو، کە کۆسپی چیاو چۆڵ کارتێکردنی لەسەر نیە! ئەم وەسفە خواییە ئاماژەیەکی تیرو توانجی لەخۆ گرتووە بەرامبەر بەو کەسانەی، کە تەفرەقە دەخەنە ناو موسوڵمانان و ڕیزی خواناسان بە پوازی ئینتیمای تیرەو هۆزو ناوچەو زمان و دەمارگیریی ئەوانە دەقلیشێنن... سەرەنجام ئوممەتەکە دابڕ دابڕ دەکەن و هەر بڕەش بە لایەکدا پەرتەوازە دەکەن و دیواری دەرونی دەخەنە نێوان هەر بڕێکیان، کە دابڕ کەوتووەو لاڕێ کەوتوە!! هەستی ئەم شاعیرە چەند بەرزە کە ووتوێتی:

يا أخِي المسلمُ في كلِّ مكانٍ وبَلَدٍ　　أنتَ منِّي وأنا مِنْكَ كَروحٍ في جَسَدٍ

برام لە هەرجێی زەمێنی کە مادام برای دینیـــن

من لە تۆم و تۆ لە من ڕۆحی جەستەیە پێك دێنین

## ٢ـ برایەتی دینیی مایەی ئاوەدان کردنەوەی سەر زەمین و ڕزگـاریخوازیی مرۆڤە:

ئەوی برایەتی دینیی لە پەیوەندیەکانی تر جویێ دەکاتەوە ئەوەیە، کـە برایـەتی دینیی دیداری یەکخواناسان و یەکگرتنیانە بۆ کاری مـەزنی بنیاتنـانی ژیـان، بـۆ ئەرکە مەزنەکەی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) کەڵەپیاوانی مێژوو!

ئەم برایەتیەیە، کە موسوڵمان دلێرانە گۆش دەکـات، تـا ڕووەوڕووی تاغوتـانی بێتەوەو سەر زەمـین بـە خێرخـوازی ئـاوەدان کاتـەوە، تـا بـە دادی خـوا ویـستی کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتیەکـەی ئاسـودە کاتـەوە... کـەواتوو ئەمـە هـەر بەسـتنی پەیوەنـدی برایـەتی نیـە، ئەمـە بەگـەڕ خـستنی وزەی هەموانـە بـۆ هێنانـەدی ئامانجێك، کە موسوڵمان بە تەنها پێی نایاتـە دی، هێنانـەدی ئامـانجی گـەورەش پێویستی بە ڕەنج و وزەی هەموو براکان پێکەوە هەیە... ئەمەش برایـەتی پێـڕەوو پڕۆگرامی کۆمەڵکارییە، کە غەیری ئێمـە پێـی دەڵێـت: هاوڕێیـەتی ڕێکخـستنی سیاسی...

برایەتی دینیی، کۆمەڵکاریی ئیسلامیانەیە، کە لادان و ڕادانی تاغوتـانی پـێ دێتە دی و دەوڵەتی ئیسلامی پێ دادەمەزرێتەوە، کە هەم برایەتیەکە، هەم سایەی دەوڵەتـە ئیـسلامیەکە دەبنـە ئـامێری بڵاوکردنـەوەی دادی خـوا ویـستی بەسـەر کۆمەڵگەکەدا... ئەمەش برایەتیەکـە، کـە غـەیری ئێمـە پێـی دەڵێـت: هـاوڕێی خەباتی چەکداریی...

پێغەمبەری پێشەواﷺ پێش هەموو شتێك لە مەدینە ئەم برایەتیەی لـە نێـوان کۆچەرانی مەککە و پشتیوانانی مەدینەدا دروست کرد، چـونکە دەیزانـی ئەمەیـە یەکەمین بەردی بناغەی کۆمەڵگەو دەوڵـەتێکی شارسـتانێتی شـیاو، کـە توانـای چەسپاندنی شەرعی لە ناو خۆداو توانای هەڵگرتنی بانگەوازی خوایی بۆ گەلانی تر هەبێت، سەر زەمینیش ئاوا ئاوەدان دەکرێتەوە...

### ٣ـ برایەتی دینیی یەك جەستەییەو هیچ دەمارگیرییەك کاری تێ ناکات:

برایەتی دینیی برایەتیەکی ئایدۆلۆژییە، لە زەمینەیەکی بیروباوەڕەوە دەرچـووە، چونکە موسوڵمانان خوایان یەکە، پێغەمبەریان یەکە، پـەیامیان یەکـە، قیبلـەیان یەکە، بەرنامەیان یەکە...

موسوڵمانان وەکو یەك جەستەن، کە یەك ڕۆحی تێدایەو یەك ژیریـی ئاڕاسـتەی دەکات، ڕویان لە یەك ئاسۆیە، چونکە ئامانجیان یەکە، بڕوانە چـۆن پێغەمبـەرﷺ دەفەرموێ: ((مَثَلُ المؤمنينَ في تَوادِّهِم وتراحُمِهم وتعاطُفِهم مَثَلُ الجَسَدِ اذا اشْـتَكَى مِنْهُ عضوٌ تَـداعَى لَـهُ سـائِرُ الجَسَدِ بِالـسَّهَرِ والْحُمَّـى)) بوخـاری/٥٥٥٢ و ٥٦٦٥، موسلیم / ٤٦٨٥ و ئەحمەد / ١٧٦٤٨ واتە: (نمونەی موسوڵمانان لە نـاو خۆیانـدا لە خۆشویستن و بەزەیی و سـۆزیاندا دەرهـەق یـەکتر، وەکـو جەسـتەیەکن، ئەگـەر ئەندامێکی ئازاری گەیـشتێ، سـەرتاپای جەسـتە تـا دای دەگرێـت و شـەونخونی دەکێشێت... )ئەمەش برایەتیەکە لە پێش برایەتی دایکیەوەیە، لە پـێش برایـەتی شیرو نەسەبی تیرەو هۆزەوەیە، لە پێش ئینتیمای گەل و نیشتیمانەوەیە، لـە پـێش هەموو جۆرە ئینتیمایـەکی ترەوەیـە، لـە هـەموویان لـە پێـشترە، لـە هـەموویان بەرێزترە، ئەم لە وەحی خواوە هاتووە، ئەوانی تر ئەگەر بە هـەر شـێوەیەك لەگـەڵ برایەتی دینیدا یەك نەگرنەوە، دەبێت لەبەر خـاتری پەیوەنـدی برایەتیـە دینیەکـە وەلانرێن... نابێ لەسەر حسابی ئەم بێنە پێش...

(٢)

# برایەتی دینیی

## فەزڵی خوایەو لەبەر خاتری ئەوە

دەقێکی زۆری قورئان و حەدیس لەسەر گەورەیی و فەزڵی برایەتی دینیی و خۆشویستنی یەکتریی هەیە، کە دەبێ لەبەر خاتری خوا بێت بۆ پشتگرتنی یەکترو، سەرخستنی یەکتری لەبەر خاتری خوا بێت، خاوەن ئەو هەست و هەڵوێستە زۆر مەدحی کراوەو پاداشتی زۆری دنیایی و قیامەتی بۆ دیاری کراوە، لەوانە:

### ١ـ برایەتی دینیی فەزڵ و نیعمەتی خوای گەورەیە:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾ ال عمران/ ١٠٣ واتە: (ئەو نیعمەتەی خوای گەورەتان لە یاد بێت، کە وا بەسەرتانەوە، بیرتانە کە دوژمنی یەکتریی بون، خوای گەورە دڵەکانتانی پێکەوە ڕام هێنان و بەو نیعمەتەی خوا (کە ئیسلامە) بون بە برای یەکتریی؟! ئەوەشتان لە یاد بێت، کە ئەو کاتەی خوای گەورە ڕزگاری کردن، لە ڕۆخی کەندەڵانێکی ئاگر بون، ئەو قوتاری کردن لێی، خوای گەورە ئەئاوا نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەداتەوە، تا ڕێنماییە خواییەکە وەرگرن و هیدایەت درێن...)

کەوابوو پێش هەموو شتێك برا عەزیزەکەم، ئەوەت لە یاد بێت، کە برایەتی دینیی نیعمەتی خوای گەورەیەو فەزڵی ئەویشە، کە کردوێتیە پەیوەندی پتەوی

نێوانمان و بە هۆی ئەو هەستە بەرزەوە، کردوینی بە برای لایەنگرو پشتیوانی یەکتریی... ئەم نیعمەتە کاریگەرو گرنگەش، کە تەنها لە خوای گەورەوەیە، خوا بە هەموو کەسێکی نابەخشێت، تەنها بەو کەسانەی ڕەوا دەبینیت، کە موسوڵمانی پاك و چاك و سەڕاستن، خوای گەورە بەم هەستە بەرزە لە موسوڵماناندا دەیڕوێنێت، قین و بوغزی دڵ و دەرونیان دەسڕێتەوە، کە لە هەواو هەوەس و حەزی مونحەریفیانەوە، یا لە هەستی جاهیلییەتی ئینتیمای تیرەو هۆزو ناوچەگەرێتی و نەتەوایەتیانەوە هاتووە، هەر بە لوتفی خۆی ئاڕاستەی تەقواو جوامێرییان دەکات، تا بەسەر نەفسی خۆیاندا زاڵ بن و برایەتیەکەیان پێ گرنگ دەبێت و لەسەر بنەمای ئەوەوە، ڕەفتار لەگەڵ یەکتریدا دەکەن، تا وایان لێ دێت دەبنە یەك ڕۆحی سەدان و هەزاران جەستە، یەك هەستی کۆمەڵکاریی سەدان و هەزاران تاك، یەك بیروباوەڕی هەزاران و ملیۆنەها خاوەن ئینتیمای عەقیدەیی!!

## ٢ـ برایەتی دینیی ڕێی خۆشەویستی خوای گەورەیە:

وەدەست هێنانی خۆشەویستی خوای گەورە، ئامانجی سەرەکی خواناسەکانە، دەقە قورئانی و فەرمودەکان ئەوە ڕون دەکەنەوە، کە خۆشەویستی نێوان موسوڵمانان هۆکارێکی سەرەکیە بۆ خۆشویستنی خوای گەورە، چونکە ئەوان لەبەر خاتری جەنابی خوای پەروەردگاری خاوەنیان، یەکتریان ئاوا خۆشویستوەو بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو، وا هاوکاری یەکتربون... هەتا ئەمان هاتوچۆو هاریکاریی و یارمەتیدان و بەخەمەوە هاتنی یەکترییان لە نێواندا زیاتر بێت، زیاتر شایانی خۆشەویستی خوایی دەبن و زیاتر لە جەنابیان نزیك دەبنەوە... سەرنجدە:

*پێغەمبەری پێشەواﷺ گێڕایەتیەوە ((أَنَّ رَجُلًا زَارَ أَخًا لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى فَأَرْصَدَ اللَّهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكًا فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قَالَ أَيْنَ تُرِيدُ قَالَ أُرِيدُ أَخًا لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ قَالَ هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا قَالَ لَا غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللَّهِ عَزَّ

وَجَلَّ قَالَ فَإِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ بِأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ))موسلیم / ٤٦٥٦ واتە: (کابرایەك بۆ دیدەنی دەچووە لای برایەکی لە ناوچەیەکی تر، خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ ناردە سەر ڕێی، کە بە یەکتری گەیشتن، فریشتەکە پرسی: بۆ کوێ دەچیت؟ ووتی: دەمەوێ دیدەنی برایەکم بکەم لەو ناوچەیە، فریشتەکە فەرمووی: هیچ مافێکت لەسەریەتی (وەکو قەرزو شتی وا)؟ ووتی: نەخێر، بەڵام هەر لەبەر خاتری خوای گەورە خۆشم ویستووە... فریشتەکە پێی فەرموو: دەی سا من فریشتەی خوای گەورەم و بۆ لای تۆی ناردوم، تا پێت ڕاگەیێنم، کە خوای گەورە پێت دەفەرموێ، کە تۆی خۆش دەوێت مادام تۆ لەبەر خاتری ئەو، ئەو برایەت خۆشویستووە...)

* ئەبو ئیدریسی خەولانیﷺ، کە یاوەرێکی ئازیزی پێغەمبەر بوو صلی الله علیه وسلم گوتی: چومە مزگەوتی دیمەشق لە شام، بینیم گەنجێکی جوان دانیشتووەو خەڵکی وەکو ئاڵقە دەوریان داوە، لە هەر مەسەلەیەکدا ناکۆك دەبن، ڕوو لەو دەکەن و ڕای ئەو پەسەند دەکەن! پرسیم ئەوە کێیە؟! ووتیان: ئەوە مەعازی کوڕی جەبەلە... بۆ سبەی چوومەوە ئەوێ، دیتم نوێژ دەکات، لەسەری وەستام تا تەواو بوو، ڕوبەڕوی هاتم و سڵاوم لێ کرد و پێم ووت: ((وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ لِلَّه عَزَّ وَجَلَّ فَقَالَ أَاللَّه فَقُلْتُ أَاللَّه فَقَالَ أَاللَّه فَقُلْتُ أَاللَّه فَأَخَذَ بِحُبْوَةِ رِدَائِي فَجَبَذَنِي إِلَيْهِ وَقَالَ أَبْشِرْ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ وَالْمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ)) ئیمامی ئەحمەد/سەحیحە (٢٠٩٩٥)ە واتە: بەخوا قەسەم، من تۆم لەبەر خاتری خوای پەروەردگار خۆش دەوێت، گوتی: توخوا وایە؟! ووتم: ئەرێ بە خوا وایە، گوتی: توخوا وایە؟ ووتم: ئەرێ بەخوا وایە، ئینجا یەخەی کراسەکەمی گرت و گوتی مژدە بێت، من بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەر بووە صلی الله علیه وسلم کە فەرمویەتی: (خوای گەورە فەرمویەتی: خۆشەویستی من بۆ ئەو

کەسانە فەرز دەبێت، کە لەبەر خاتری من یەکتریان خۆش دەوێت، لەبەر خاتری من لەگەڵ یەك کۆدەبنەوەو دادەنیشن، لەبەر خاتری مـن زیـارەتی یـەکتری دەکـەن و، لەبەر خاتری منیش بەیەکتر دەبەخشن)...

## ٣ ـ برایانی دینیی لەژێر سایەی خوادان:

* ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت گێڕایـەوە، کـە پێغەمبـەری خۆشەویـست صلی الله علیه وسلم فەرموی: ((إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ أَيْـنَ الْمُتَحَـابُّونَ بِجَلَـالِي الْيَوْمَ؟ أُظِلُّهُـمْ فِـي ظِلِّـي يَـوْمَ لَـا ظِـلَّ إِلَّـا ظِلِّـي)) موسـلیم/ ٤٦٥٥ واتـە: خـوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا دەفەرموێ: کوان ئەوانەی لەبەر خاتری گـەورەیی مـن یەکتریان خۆش دەویست؟! ئەمڕۆ کە هیچ سایەیەك نیـە، جگـە لـە سـایەی مـن، دەیانخەمە ژێر سایەی خۆمەوە...

* هەر ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە، کە پێغەمبەری نازدار صـلی الله علیه وسلم فەرموی: ((قَالَ سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ- وذکـر منهم - وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْـهِ)) بوخـاری/٦٣٥.خـوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا حەوت کۆمەڵە خەڵکی هەن، کـە دەیانخاتـە ژێـر سـێبەری خۆی ـ لەو ڕۆژەدا، کە هیچ سایەیەك نیە، جگە لە سایەی خـوای گـەورە خـۆی... لەوانە(دوو کەسن، کە لەبەر خاتری خوای گەورە یەکترییان خۆشـویستووە، لەبـەر خاتری ئەو بەیەکتریی دەگەن و لەبەر خاتری ئەویش لێك دادەبڕێن)...

سەیری ئەم دڵنیاییە خواییە بکە؟! لە چ ڕۆژێکیشدایە؟! لەو ڕۆژەدا، کە خۆر بە بڕی یەك میل لە خەڵکی دوورەو خەڵکی لە چاوەڕوانیدان و، ناشزانن کەی دەبـڕێن بۆ لێپرسینەوەیان!! لەو ڕۆژە پـڕ تـرس و بیمـەی هـەموو خـەڵکی هـاوار دەکـەن: نەفـسی نەفـسی... ئـەمان لــە شــنەی ڕۆح و ئاسـودەیی دەرون و حەوانـەوەی جەستەییدان!! ئای کە پلەیەکی بە بەهایە. خوای خۆشەویستمان بـە لـوتفی خـۆی پێمان ببەخشێت.

## ٤ ـ پلەو مەنزیلەی برایانی دینیی جێ ئاواتی پێغەمبەرانە:

پێغەمبەری خواناسمان صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ((إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّه لَأُنَاسًا مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءَ وَلَا شُهَدَاءَ يَغْبِطُهُمْ الْأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمَكَانِهِمْ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى قَالُوا يَا رسولَ اللَّه تُخْبِرُنَا مَنْ هُمْ قَالَ هُمْ قَوْمٌ تَحَابُّوا بِرُوحِ اللَّهِ عَلَى غَيْرِ أَرْحَامٍ بَيْنَهُمْ وَلَا أَمْوَالٍ يَتَعَاطَوْنَهَا فَوَاللَّهِ إِنَّ وُجُوهَهُمْ لَنُورٌ وَإِنَّهُمْ عَلَى نُورٍ لَا يَخَافُونَ إِذَا خَافَ النَّاس وَلَا يَحْزَنُونَ إِذَا حَزِنَ النَّاسُ وَقَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ)) ئەبو داود (٣٠٦٠) واتە: لە ڕۆژی دواییدا کەسانێك لە بەندەکانی خوای گەورە هەن، کە نە پێغەمبەرو نە نێرراوانی خوان، نە لە شاهیدو شەهیدانیشن، کەچی پێغەمبەران و شاهیدو شەهیدان سەرسام دەمێنن لەو پلەو پایەی، کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە پێیان دراوە، یاوەران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا، بۆمان باس دەفەرمویت، کە کێن؟! فەرموی: ئەوانە کەسانێکن کە لەبەر خاتری خوای گەورە یەکتریان خۆش ویستووە، بێ ئەوەی خزمایەتیەك لە نێوانیاندا هەبێت، یان پارەو سامانێك لە بەینیاندا بێت، یەکیان لەبەر خاتری خوا گرتووە، سوێندم بە خوا ئەوانە ڕویان گەش و نورانیە و لەسەر نور دانیشتون، کاتێك خەڵکی ترس و بیمی لێ دەنیشێت ئەمان لە ئەماندان، کە خەڵکی خەفەتبار دەبن، ئەمان ئاسودە دەبن!! ئینجا ئەو ئایەتەی قورئانی خوێندەوە، کە دەفەرموێ: دۆستانی خوا، نە ترسیان لێ دەنیشێت و، نە خەمیش دایان دەگرێت...

بێگومان ئەمە مانای ئەوە نیە، کە پلەو مەنزیلەی ئەم بەڕێزانە سەرو پلەی پێغەمبەران و شاهیدان و شەهیدان کەوتووە، بەڵکو ئەمان لەوە سەرسام دەبن، کە بە چی وا گەیشتونەتە ئەو پلە بەرزە؟!

## ٥ ـ برایەتی دینیی مایەی چێشتنی شیرینی باوەڕە:

* پێغەمبەری خۆشەویست صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (مَنْ أَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ وَأَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ وَأَنْكَحَ لِلَّهِ فَقَدْ اسْتَكْمَلَ إِيمَانَهُ) ترمزی / ٢٤٤٥ واتە: هەر کەسێك لەبەر خاتری خوا ببەخشێت و لەبەر خاتری خوا بگرێتەوە، لەبەر خاتری خوا خۆشی بوێت و لەبەر خاتری خوا ببوغزێنێت، لەبەر خاتری خواش هاوسەرێتی بگرێت، ئەوە باوەڕی خۆی تەواو کردووە...

* هەروەها دەفەرموێ: ((ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ))متفق علیه (بوخاری١٥ و موسلیم٦٠) واتە: سێ سیفەت هەن لە هەر کەسێکدا هەبن باوەڕی خۆیان پێ تەواو دەکات:

ـ خواو پێغەمبەری خوای لە هەموو کەس زیاتر خۆش بوێت .

ـ هەر کەسێکی خۆشەویست لەبەر خاتری خوای گەورە خۆشی بوێت .

ـ ئەوەندە گەڕانەوەی بۆ ناو کوفرو کافران ببوغزێنێت، هەر وەکو ئەوەی، کە فڕێ دانە ناو ئاگری دەبوغزێنێت...

* هەروەها دەفەرموێ :(لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ) متفق علیه (بوخاری١٢ و موسلیم ٦٤) واتە: هیچتان باوەڕی دانامەزرێت، تا ئەو شتەی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ براکەشی پێخۆش نەبێت...

ورد سەرنج لەم ڕەفتارەو ڕەوشتانە بدە، کە بە ڕەسەنێتی پیرۆزیی دینیی لە ناخی تاك و کۆی کۆمەڵگەیەك دەچەسپێت و هێندە مومارەسە دەکرێت، تا دەبێتە بەهاو نەریتی کۆمەڵایەتی، ئینجا بزانە چ ئاسەوارێکی ئیجابی جێ دەهێڵێت!؟

بزانە ئەگەر لە گوندێکدا دانیشتوانەکەی لەسەر ئەم مافانەی یەکتریی و برایەتیە دینیە پەروەردە بون و، ئاوا لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئاڕاستانەدا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکتر کرد، چەند تێکەڵ و خەمخۆری یەك دەبن... گوندەکە بکە بە شارۆچکەیەك، بزانە چ کاریگەرییەکی ئیجابی لەناو خەڵکیدا دروست دەبێت... پیاوخراپانی هەرچەند زیاد بن، ناتوانن ئەم دیدو رەفتارو بەها پیرۆزانە لاواز بکەن، بە پێچەوانەشەوە ئەوان ڕویان نایەت خۆ وا دەرخەن، کە دەتوانن و لە ڕویان دێت سەرپێچی لێ بکەن، چونکە هەر هیچ نەبێت پێیان عەیبەو شورەیی دەبێت... ئینجا خەمی سومعەی خۆیان دەبێت و پاشان، ئەگەر یاساش نەبێت!لە کاردانەوەو بەرهەڵستی خەڵکەکە دەترسن، چ جای ئەوەی بەسەر هەموو ئەمانەوە یاسایەکیش هەبێت، کە جیاوازی نێوان کەس ناکات...

# بەشی دووەم

## ماف و ئەركی برایەتی دینیی

برایەتی دینیی هەر ئەوەندە نیە، كە هەستێكی فیكریی و هەڵوێستێكی دەرونی بێت، بەڵكو بە دڵنیاییەوە پێش هەموو شتێك ئەركێكی ئیماندارانەی سەر شانی موسوڵمانە، كۆمەڵێك كارو هەڵوێستە، كە حەتمەن دەبێت ئەنجام بدرێت و لە واقیعدا دەركەوێت، تا شاهێدی لەسەر هەبونی ئەو هەستی برایەتیە بدات و بیسەلمێنێت... وا هەندێك لەو ماف و ئەركانە ڕون دەكەینەوە، كە موسوڵمانان بەسەر یەكیانەوە هەیە، كە هەمویان لە ئاڕاستەی قورئانی پیرۆزو حەدیسی سەحیحەوە هاتوون، هەندێكیان دەگەنە ئاستی فەرزێتی و هەندێكی تریشیان لە ئاستی یەكەمی بەڵگەنە ویستی برایەتیەكەن... جا ئەوی خواناس و خواویستەو بە خەم قیامەتی خۆیەوەیەتی، با ئاوڕێك لە گیان و عەستی برایەتی خۆی بداتەوەو بزانێت، ئایا لەگەڵ ئەم دەقە پیرۆزانەو سیرەو ڕەوشی موسوڵمانی سەرڕاستدا یەك دەگرێتەوە...

### ١- دۆستایەتی كردن لەسەر بنچینەی خۆشەویستی خوا:

تەركیزی دەقە پیرۆزەكان لەسەر ئەوەیە، كە موسوڵمان دەبێت دۆستایەتی خۆی لەگەڵ خەڵكانی تردا لەسەر بناغەی خۆشەویستی خوای گەورە داڕێژێت، تا بتوانێت گیانی برایەتی دامەزرێنێت و گەشە بە هەستی برایەتیەكەی خۆی بدات... كۆمەڵێك دەقمان پێشتر هێنایەوە، كە باشترە بچیتەوە سەریان، تا یادت بێنەوە...

خۆشەویستی موسوڵمان، ماف و ئەركێكە و خوای گەورە فەرزی كردوەو یەكێكە لەو هۆكارانەی دەگەێنێتە بەهەشت... پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا)) موسلیم/ ٨١ واتە: ناچنە

بەهەشتەوە تا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیشتان نابێـت، تـا یـەکتریتان خـۆش نـەوێت... ئیبنو هیشام لـە کتـێبی (سیرة)کـەی خۆیـدا دەگێڕێتـەوە، کـە ئیبنـو ئیـسحاق گێڕایەوە، کە پێغەمبەرﷺ جارێکیان وتاری دەدا فەرمووی: ((أحِبُّوا مَا أَحَبَّ اللهُ، أحِبُّوا اللهَ مِنْ كُلِّ قُلُوبِكُمْ، ولا تَمِلُّوا كَلَامَ اللهِ وذِكْرَهُ، ولا تَقْسُ عَنْهُ قُلُوبُكُم... وتَحَابُّوا بِروحِ اللهِ بينَكُم)) (سيرة أبن هشام (٣/٣٠) واتە: ئەوەتان خۆش بوێت، کە خوای گەورە خۆشی دەوێت، خواتان لە ناخی دڵتانـەوە خـۆش بوێـت لـە قورئـان خوێندنیشدا بێزار و بێ تاقەت نەبن لێی، دڵتان بەرامبەری ڕەق نەبێت... بەگیانی خواویستیەوە لەبەر خاتری خوا یەکتریتان خۆش بوێت...

ئەم حەدیسە پیرۆزو دەقی ناوبژین لەسەر فەرزێتی خۆشویستنی موسوڵمانان لـە ناو خۆیاندا لەبەر خاتری خوای گەورە... دەقی حەدیسەکە فەرمانە، فەرمانیش لە زمانی عارەبیدا وەکو زمانەوانەکان و ئوسوڵیە شەرعناسەکان دەفـەرمون: فـەرمان بۆ فەرز بوونە، مەگەر وشەیەکی هاوڕێی لەگەڵدا بێ ماناکەی تایبـەت بکـات بـە سەرپشك کردنەوە، یان بیکات بە هاندانی سەربەستانە...

پێغەمبەری نازدار بە یاوەرانی دەفەرمو، کە هەر کەسێك کەسێکی تری خۆش ویست، با هەواڵی بداتێ، کە خۆشی دەوێت... وەك ئەوەی کـە ئەنـەس خـوا لێـی رازی بێت دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ((مَرَّ رَجُلٌ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ جَالِسٌ فَقَالَ الرَّجُلُ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّ هَذَا فِي اللَّهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبَرْتَهُ بِذَلِكَ قَالَ لَا قَالَ قُمْ فَأَخْبِرْهُ تَثْبُتِ الْمَوَدَّةُ بَيْنَكُمَا فَقَامَ إِلَيْهِ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ أَنِّي أُحِبُّكَ فِي اللَّهِ أَوْ قَالَ أُحِبُّكَ لِلَّهِ فَقَالَ الرَّجُلُ أَحَبَّكَ الَّذِي أَحْبَبْتَنِي فِيهِ)) رواه أبـو داود (٤٤٦٠) وأحمـد (١٣٠٤٥٦) بسند صحيح واتە: (پیاوێك بـە لای پێغەمبـەرداﷺ تێپـەڕی، کـە کابرایەکی لە خزمەتدا دانیشتبوو.

کابرا ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من ئەو پیاوەم لەبەر خاتری خوا خۆش دەوێت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پێت ووتووە، کە خۆشت دەوێت؟ کابرا ووتی نا، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: هەستە بڕۆ هەواڵی بدەرێ، ئەویش چوو بە پیاوەکەی ووت من لەبەر خاتری خوای گەورە تۆم خۆش دەوێت، ئەویش پێی ووتەوە: دەی سا ئەو خوایە تۆی خۆش بوێتەوە، کە تۆ لەبەر خاتری ئەو منت خۆشویستووە...

دیسان پێغەمبەر بەردەوام ئامۆژگاری یاوەرانی دەکرد، کە بە سۆراخی ئەو یەکتر خۆشویستنەوە بن و بەردەوام چاودێریی بکەن و بە هەر شێوەیەك، کە بۆیان دەلوێت گەشەی پێ بدەن و زیاتری کەن، بۆ نموونە، بە دیاری بۆ بردن و خەڵات گۆڕینەوە، بێ ئەوەی لەسەر خۆشیانی قورس کەن، وەك دەفەرموێ: ((تَصَافَحُوا يَذْهَبْ الْغِلُّ وَتَهَادَوْا تَحَابُّوا وَتَذْهَبَ الشَّحْنَاءُ)) رواه مالك (١٤١٣) وهو حسن... واتە: تەوقە بکەن لەگەڵ یەکتریی، کینەتان لادەبات، دیاریش بدەنە یەکترتان خۆش دەوێ، تا بوغزی نێوانتان ڕادات...

هەروەها ئامۆژگاری ئەوەی دەکردن، کە بەردەوام سەلام لە یەکتری بکەن، تا خۆشەویستیەکەی نێوانیان پەرە بستێنێت، وەك دەیفەرموو: (لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ) رواه احمد ومسلم وابو داود والترمذي وابن ماجه واتە: ناچنە بەهەشتەوە، تا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیشتان نابێت، تا یەکتریتان خۆش نەوێت، ئایا ئەو ڕێیەتان نیشان دەم، کە ئەگەر گرتانە بەر یەکتریتان خۆش بوێت؟! تەشەنە بە سڵاو لێك کردن بکەن لە ناو خۆتاندا...

کە سەرنج لە سیرەی پێغەمبەری پێشەوامان دەدەین، دەیان جۆرو شێوازی دیکەمان بەرچاو دەکەوێت، کە وەك نموونە خستوونیەتە بەرچاوی موسوڵمانان، تا

بیگرنە بەر، تا گەشە بە خۆشەویستی خواناسانەی خۆیان بدەن... کە لە داهاتودا هەندێکی تریشیان لە باسەکاندا دەهێنینەوە (ان شاء الله)... بەڵام ئەوەی گرنگە هەر لەسەرەتاوە لەبەرچاومان بێت و لێی بێ ئاگا نەبین ئەوەیە، کە مەسەلەی برایەتی دینیی و یەکتریی خۆشویستن لەبەر خاتری خوای پەروەردگار، تەوەرێکە دینداریی بەدەوردا دەخولێتەوە... یەکتر خۆشویستن لەبەر خاتری خوای گەورە، بناغەی کۆمەڵکارییە ئوممەتیەکەی موسوڵمانانە... بۆیە ئەو کەسانەی، کە لەبەر خاتری خوای پەروەردگار یەکتریان خۆش دەوێت پێویستە هەمیشە لە یادی یەکتریدا بن و هەموو هۆکارەکان بگرنە بەر، کە خۆشویستنەکەیان زیاتر دەکات و برایەتیەکەیان پتەوتر دەکات... بۆیە پێویستە هەمیشە وەکو باخەوان چاودێری باخی برایەیەتیان بکەن لە دڕك و داڵی کینەو بوغز بژاری کەن و هەمیشە بە خواویستی ئاودێریی بکەن، تا لە واقیعێکی دنیاییدا بەرجەستەی کەن و، خەڵکیش بە نموونەی برایەتی ئیسلامەتی بیانبینێت...

## ٢ـ دڵنەوایی و دڵسۆزیی هاوڕێیانەو خۆش مەشرەبی:

## ئەمەش لە چەند لایەکەوەیە:

### أ ـ خۆ ڕاهێنان لەسەر چاکەی خۆبەخش:

ـ ئەمەش بەوە دەبێت، کە موسوڵمان سۆراغی پێداویستی برا موسوڵمانەکانی تری بکات و زوو هەست بە ئاتاجییان بکات، تا بە هانایانەوە بچێت پێش ئەوەی ئەوان ناچار بن پێی لە جەرگی خۆیان بنێنن و بە ڕوی سورەوە داوا بکەن... موسوڵمان پێویستە خۆی لەسەر ئەوە ڕاهێنێت، کە هەر کاتێك شتێکی زیادەی هەبوو بیداتە موسوڵمانانی تری موحتاج... هەر هەمومان دەبێ ئەوە بزانین، کە ئەگەر برا موسوڵمانەکەمان داوای شتێکی لێ کردین، کە زیادەیەو شکی پێ

بردووە، کە لامان دەست دەکەوێت دەکرێت ببەخشرێت، بۆیە داوای کـردووە ئەمـە خۆی لە خۆیدا نیشانەی کەمتەرخەمیمانە، نیـشانەی ئەوەیـە، کـە بـە تەنگیـەوە نەچوین و هەستمان بە نەبونیەکەی نەکردووەو ئەومان لە ڕوی دەرونیەوە گەیاندۆتە ئەو حاڵەتە قورسـەی کـە خـۆی داوای کـات... خـۆ شـت داواکـردن لـە خـەڵکی ڕەفتارێکی ئاسان نیە، ئەوەندە لەسەر دڵ قورسە، کە یاوەرانی پێغەمبـەری نـازدار صلی الله علیه وسلم دەیانفەرموو: ئابڕو دەبـات!! هـەر کەسـێکمان گەیـشتە ئـەم ئاستە پێویستە، زوو بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورەو تۆبە بکات... کابرایـەك بـە ئەبوهورەیرەی ووت خوا لێی ڕازی بێت: دەمەوێ برایەتیت لەگەڵ ساز کەم و ببمـە برادەرت! گوتی: دەزانی مافی برا لەسەر برا چیە؟ کابرا ووتی: نازانم فێرم کە، ئـەبو هورەیرە گوتی: ئەوەیە، کە خۆت لە مـن زیـاتر بـە خـاوەن دینـارو درهەمەکـەی گیرفانت نەزانیت!! کابرا ووتی: بە خوا هێشتا نەگەیشتومەتە ئـەو ئاسـتە!! ئیـدی ئەبوهورەیرە گوتی: دەی مادام وایە لێم گەڕێ.

ئەم وەڵام و هەڵوێستەی ئەبوهورەیرە خوا لێـی ڕازی بێـت ڕەفتـارێکی دەرونـی خۆی نیە، نا، ئەمە حەقیقەتێکی بەڵگەنەویستە، کە کۆمەڵێك ئایەت و حەدیـسی پێغەمبەری نازدارﷺ جەختی لەسەر دەکەنەوە... هـەموو ئـەوە دەسـەلمێنن، کـە قەوارەی موسوڵمانان یەکە، هەست و هۆشیان وەکو بیرو باوەڕیـان یەکـە، ڕەفتـارو هەڵوێستیان، کە هەڵهێنجراوی عەقیدەکەیانە، دەبـێ وەکـو یـەك بێـت!! ناشـێت دیواری دەرونی ببێتە بەربەستی نێوانیان... ناشـێت مـن مـن و تۆتـۆی ئـەنانێتی بەسەر هۆشیاندا زاڵ بێت!! ئەمەش هەندێك لەو ئاڕاستە شەرعیانە:

* (عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ فِي سَفَرٍ مَعَ النَّبِـيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى رَاحِلَةٍ لَـهُ قَـالَ فَجَعَـلَ يَـصْرِفُ بَـصَرَهُ يَمِينًـا وَشِمَالًا) ئـەبو سەعیدی خودریﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەرداﷺ

بوین، کابرایەکی سوار هاتە ناومان و چاوی بە ڕاست و چەپدا گێڕا (وەك ئەوەی پێویستی بە شتێکی خواردن بێت) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێغەمبەرﷺ فەرمویْ: (مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا ظَهْرَ لَهُ وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلٌ مِنْ زَادٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا زَادَ لَهُ قَالَ فَذَكَرَ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ مَا ذَكَرَ حَتَّى رَأَيْنَا أَنَّهُ لَا حَقَّ لِأَحَدٍ مِنَّا فِي فَضْلٍ) موسلیم (٣٢٥٣) واتە: ئەوی ولاخێکی بەتاڵی پێیە، با بیداتە ئەوی ولاخی پیْ نیە سواری بێت (یا با لە دوای خۆیەوە سواری کات)، ئەوی خواردنی زیادەی پێیە، با بیداتە ئەوی خۆراکی پیْ نیە... ئەوەندەی جۆری سامان و ماڵ باس فەرموو، تا گەیشتینە ئەوەی دڵنیا بوین، کە کەس شتێکی وای پیْ نیە لێی زیاد نەبێت، تا نەیداتە کەسانی تر... واتە هەر یەکەمان حەتمەن شتێکی وامان هەر پێیە، کە کەسێکی تر پێی نیە!!

* عن عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّهُ اعْتَلَّ بَعِيرٌ لِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ وَعِنْدَ زَيْنَبَ فَضْلُ ظَهْرٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِزَيْنَبَ: (أَعْطِيهَا بَعِيرًا فَقَالَتْ أَنَا أُعْطِي تِلْكَ الْيَهُودِيَّةَ فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهَجَرَهَا ذَا الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمَ وَبَعْضَ صَفَرٍ) أبو داود (٣٩٨٦) وغيره وهو حسن واتە: (عائیشە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێ: وشترێکی سەفییەی کچی حویەی نەخۆش کەوتبوو، زەینەبیش وشترێکی زیادەی پێبوو (هەردوکیان خێزانی پێغەمبەری نازدارنﷺ) پێغەمبەرﷺ بە زەینەبی فەرموو: وشترە زیادەکە بدە بە سەفییە، کەچی زەینەب گوتی: بیدەمە ئەو جولەکەیە؟(چونکە زەینەب کچی حویەی کوڕی ئەختەب بوو کە جولەکە بوو) پێغەمبەرﷺ زۆر تووڕە بوو بۆیە هەموو مانگەکانی زیلحیجەو موحەڕەم و بەشێکیش لە مانگی سەفەر خۆی لیْ دابڕی و نەچووە ماڵی...

* عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ :(.. ثُمَّ لَقَدْ أَتَى عَلَينَا زَمَانٌ أو قَالَ حِينٌ وَمَا أَحَدٌ أَحَقُّ بِدِينَارِهِ ودِرْهَمِهِ مِنْ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ ثُمَّ الآنَ الدِّينارُ والدِّرْهَمُ أَحَبَّ إلى أَحَدِنَا مِنْ أَخِيهِ

الْمُسْلِمِ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلى الله عليه وسلم يقولُ: (كَمْ مِنْ جَارٍ مُتَعَلِّقٌ بِجَارِهِ يَومَ الْقِيامَةِ يَقولُ يَا رَبِّ هَذا أَغْلَقَ بَابَهُ دُونِي فَمَنَعَ مَعْرُوفَهُ) بوخاری لە ادب المفرد/ حەسەنە/١٩٩ واتە: پاشان زەمانێکی وامان بەسەردا هات، یان کەوتوینە زەمانێکەوە، کە کەس لە برا موسوڵمانەکەی خاوەن مافتر نەبوو لە خاوەنێتی دینارو درهەمەکانیدا، کەچی ئێستاش ئەوەتا کەسانی وامان تێدایە، کە دینارو درهەمەکانی زیاتر خۆشدەون وەك لە برا موسوڵمانەکەی... خۆم لە پێغەمبەرمﷺ بیستووە، کە فەرموی: لە ڕۆژی قیامەتدا چەندین دراوسێ دێن گیرۆدەی دراوسێکانی تریانن (کە شکاتیان لای خوای گەورە لێ دەکەن و دەڵێن): خوایە ئا ئەمە دەرگای لەسەر دادەخستین و نەیدەهێشت خێرو خێراتەکەیمان بەر کەوێت!!

ئەم حەدیسانە ئەوە لەسەر موسوڵمان فەرز دەکەن، کە دەبێ ئەوەی لە خۆی زیادە بیداتە موسوڵمانی تر، کە پێویستی پێیەتی! جا ئەوی لە خۆی زیادەیە جلوبەرگە یان هۆدە خانووە، خۆراکە یان دەرمانە یان پێداویستی تری مرۆڤە، کە مرۆڤ پێویستی پێی دەبێت... ئینجا دەبێت بیداتە موحتاجترین کەس لەوانەی لێوەی نزیکترن، ئینجا دوورتر لەو، یان کەمتر موحتاج وەهەروەها! نابینیت پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (با بیداتە...) ئەمەش فەرمانە فەرمانیش فەرز دەکات... جا دیقەتی ئەم فەرمایشتانە بدەو سەیری واقیعی ئێستای موسوڵمانان بکە، کە چەند بەرامبەر بە یەکتریی کەمتەرخەمن؟! تۆ زیاتر ووردبەرەوە لە قەولەکەی ئیبنو عومەرؓ، کە لە سەرەتای بانگەوازی ئیسلام و پێکەوەنانی ئوممەتەکەیدا گوتی: (پاشان زەمانێکی وامان بەسەردا هات یان کەوتوینە زەمانێکەوە، کە کەس لە برا موسوڵمانەکەی خاوەن مافتر نەبوو لە خاوەنێتی دینارو درهەمەکانیدا)، بەڵام دواتر سەیری ئەو گلەیی و گازاندەی لە خۆیانی دەکات، کە هەڵوێستی موسوڵمانان چی لێ هاتووە، کە دەفەرموێ: (کەچی ئێستاش ئەوەتا کەسانی وامان تێدایە، کە دینارو درهەمەکانی زیاتر خۆشدەون

وەك لە برا موسوڵمانەکەی). جا ئەمە هێشتا باسی زەمانی یاوەرانی پێغەمبەرﷺ دەکات، کە پەروەردەی دەستی پیرۆزی ئەون؟!! ئەدی ئەگەر لەم زەمانەی ئێمەدا بوایە، چ حوکمێکی دەردەکرد؟! داخۆ ڕوی بکردایەتە کێ و هەموو تورەبونی خوی بەسەردا بباراندایە؟!! ئەمە لە نێوان نەوەیەکی قورئانیدا دەفەرموێ، کە خوای کارزان وەسفی ئاوا کردبون، کە دەفەرموێ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾الحشر/٩ واتە: (وا بە پەرۆشی یەکترەوە بون (بەرژەوەندی یەکتریان دەخستە پێش هی خۆیان) کە ئەگەر هەژاریشیان بەسەر خۆیاندا بهێنایە، باکیان نەبوو هەر دەیانکرد!! بەڕاستی ئەو کەسەی خۆی لە پیسکەیی وچاوچنۆکی نەفسی خۆی ڕاپسکێنێت ولێی دەرباز بێت ئەوانە سەرفرازن... واتە دەچێتە ڕیزی ئەو سەرفرازانەوە، کە فریشتەو پێغەمبەرانی خوا خۆزگەیان بە خۆیانە!! ).

* عن يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: (سَمِعْتُ أَنَسًا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ أَرَادَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُقْطِعَ مِنَ الْبَحْرَيْنِ فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ حَتَّى تُقْطِعَ لِإِخْوَانِنَا مِنَ الْمُهَاجِرِينَ مِثْلَ الَّذِي تُقْطِعُ لَنَا، قَالَ: سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي)بوخاری / ٢٢٠٣ واتە: یەحیای کوڕی سەعید‌ رضي الله عنه گوتی: لە ئەنەسەوەرضي الله عنه بیستم، کە پێغەمبەرﷺ ویستی گەنجینەی کۆکراوەی ئەو بەیتولمالەی کە بەحرەینەوە هاتبووە مەدینە لە موسوڵمانان بەش کاتە پشتیوانەکان ووتیان: پشك بۆ ئێمە دامەنێ، تا پێشتر بۆ برا کۆچکەرەکانمان وەکو پشکەکانی ئێمە دانەنێیت! یەعنی ئەوەندە سور بون لەسەر بەشی براکانی تریان پێش وەرگرتنی پشکی خۆیان... بۆیە پێشەوای مەزنﷺ پێی فەرمون: دوای من خۆخۆیی دەبینن، بەڵام سەبری لەسەر بگرن، تا دەمگەنێ...

خوشك و برایانی خۆم سەیری کەن! لە چ زەمانێکدا بووە دانیشتوانی شارێك ئاوا پەروەردە بوبن، کە کەسیان خەمی پشکی خۆی نەبێت و نەیەوێت بەرژەوەندی

خۆی بخاتە پێش غەریبانی شارێکی دیکە، کە هاتونەتە لایان و بووشنەتە دەسەلاتدارو کاربەدەستی شارەکەیان؟!! سەیری ئاسەواری ئەو برایەتیە کەن، کە پێغەمبەری سەرکردەﷺ لە نێوان کۆچکەرەکانی مەککەو پشتیوانەکانی مەدینەدا دروستی کرد؟! سەیری ئاسەوارو کاریگەرێتیەکەی کەن!!

* قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ آخَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنِي وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ فَقَالَ سَعْدُ بْنُ الرَّبِيعِ إِنِّي أَكْثَرُ الْأَنْصَارِ مَالًا فَأَقْسِمُ لَكَ نِصْفَ مَالِي وَانْظُرْ أَيَّ زَوْجَتَيَّ هَوِيتَ نَزَلْتُ لَكَ عَنْهَا فَإِذَا حَلَّتْ تَزَوَّجْتَهَا قَالَ فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ لَا حَاجَةَ لِي فِي ذَلِكَ هَلْ مِنْ سُوقٍ فِيهِ تِجَارَةٌ قَالَ: سُوقُ قَيْنُقَاعٍ، قَالَ: فَغَدَا إِلَيْهِ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فزاحمهم وبزهم في ميدانهم، فما لبث غير قليل حتى كسب مالاً وتأهل من ماله ولم يرزأ سعداً بشيء) بوخاری/۱۹۰۷ واتە: عبدالرحمانی کوڕی عەوف ﷺ گوتی: کە کۆچمان کرد بۆ مەدینە پێغەمبەرﷺ من و سەعدی کوڕی الرەبیعی کردە برا، سەعدی کوڕی رەبیع پێی ووتم: کاکە گیان من سامان و ماڵم لە هەموو پشتیوانەکان زیاترە، بە نیوەیی لەگەڵتی بەش دەکەم، دوو ژنیشم هەیە، سەیریان کە کامیانت پێ پەسەند بوو، بۆتی تەلاق دەدەم و کەی پێت حەلاڵ بوو مارەی کە، سەیدنا عبدالرحمان دەڵێ: ووتم: برام پێویستم پێی نییە سامان و ماڵی تۆ نیە (لە ریوایەتێکی تردا دەڵێ: خوا بەرەکەت بخاتە ماڵ و منداڵتەوە من کابرایەکی بازرگانم پێویستم بە ماڵ و سامانی جەنابت نیە) بەلام تۆ پێم بڵێ بازاڕی بازرگانیەکە لە کوێیە؟ گوتی: وا لە گەڕەکی جولەکەکانی قەینوقاعە... ئیتر عبد الرحمن چووە بازاڕەکەو بووە یەکێك لە کاریگەرانی، تا وای لێ هات کەوتە کێبڕکێی و موناقەسەی هەموو بازرگانەکان، ئاوا ماوەیەکی کەمی بردە سەر، ئیدی بووە خاوەنی سامان و پارەیەکی زۆر، کە ژنیشی پێ هێنا، بێ ئەوەی ئەرکێکیش لەسەر سەعدی کوڕی رەبیع دروست کات!!

سـەیری ئـەو نەفـسیەت و کەسـایەتیە دامەزراوانـە، سـەیری ئـەو برایـەتی و دڵسۆزییە، سەیری ئەو دەرون بەرزیەی عبدالرحمانی کوڕی عەوفیش، کـە یەکـسەر ئیعتیماد دوای خوای گەورە دەکاتەوە سەر خۆی، بێ ئەوەی ئەرکی سەعدی براشـی قورس کات!! ئەمە برایەتیـەکی نێـوان کەسـانێکە، کـە هاوشـێوەیان لـە مێـژودا دەگمەنە پیاوی وەکو سـەعدی کـوڕی ڕەبیـع لـە چ سـەردەمانێکدا هاتۆتـە دی؟! مەگەر هەر بە پێی وەحی خوایی و لەبەر دەستی پێغەمبەراندا، وەکو ئـەوەی، کـە لە ناو یاوەرانی عیساشدا ڕویدا، کە جارێك شوێن کـەوتوەکانی خـۆی کـۆکردەوەو ماڵ و سامانەکانیانی خستە سندوقێکەوەو، فەرمووی: ئەمـە سـامانی هاوبەشـی هەموتانەو پاشان وەکو یەك لێی بەش کردنەوە!!

**ب ـ ڕوخۆشی و بە ماریفەتی و خۆشحاڵ بون بە دیدار:**

قسەی خۆش لە ناو هەموو خەڵکیـدا بـە شـێوەیەکی گـشتی، مایـەی سـەرنج ڕاکێشان و دڵ بردنەوەیە، حەتمەن لە نـاو برایـانی موسـوڵماندا کاریگـەرترە، بۆیـە خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا﴾ البقـرە/٨٣ واتـە: بـە قـسەی جوان لەگەڵ خەڵکی بدوێن... پێوە پابەند بون و بەردەوام بون لەسەر قسە خۆشی و ڕوگەشی، دەبێتە دابو نـەریتی بـەرزی شارسـتانیانەی کۆمەڵایـەتی، بۆیـە خـوای پەروەردگار ئەو پیاوچاکانەی خۆی وا وەسـف دەکـات، دەفـەرموێ: ﴿وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ الحج/٢٤ واتـە: هەمیـشە پـەنایان دەبردەوە بەر سایەی قسەی جوان و بەرەو ڕێبازە پەسەند کراوەکە دەکشان!!

خوای گەورە وا باسی ئەو کەسانە دەفەرموێ، کە خۆیان بە قسەو ڕەفتاری جوان ڕادەهێنن و کردویانەتە مۆرك و سیماو پیشەیان، کە ئەوەیان بۆتە مایەی شەیتان بەزاندن! چونکە هەرچەندە شەیتان تەڵەو فاقیان لە ڕێدا دادەنێت ئەمان بەسەر

نەفس و هەواو هەوەسی خۆیاندا زاڵ دەبن و فێڵەکانی شەیتان پوچەڵ دەکەنەوە!
سەیری کەن چۆن ئێمەش ئامۆژگاری دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ كَانَ لِلْإِنسَـٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴾الاسراء/٥٣ واتە: بە بەندەکانم بڵێ، با ئەو قسەیەی، کە جوانترینە بیکەن، چونکە شەیتان ناکۆکی دەخاتە نێوانیانەوە، شەیتان بەڕاستی دوژمنێکی ئاشکرای مرۆڤە... ئەمە کە فەرمایشتی خوای گەورەیەو بە شێوەی فەرمان هاتووە، واتە فەرز بونی قسەی شیرین و ڕەفتاری جوان لەسەر موسوڵمانانێك، کە خۆیان بە بەندەی خوای میهرەبان دەزانن و، ئامادەن پەیامی پیرۆزی ئەو هەڵگرن و، بیگەێننەوە بە خەڵکی!! خوای کارزان و شارەزایە، کە بە ئێمە دەفەرموێت: قسەی جوان بکەن، وشەی جوان هەڵبژێرن، دەم و لەفزتان لەگەڵ خەڵکیدا شیرین بێت، چونکە ئاوا بانگەوازەکەو خۆشەویستی هەڵگرانی دەچنە دڵی خەڵکیەوە، ئەمەش بۆ موسوڵمان خێرەو وەکو ئەوەیە، کە خێرو خێرات ببەخشێتەوە! مەگەر نابینیت چۆن پێغەمبەری پێشەوامانﷺدەفەرموێ:(وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ)بوخاری /٢٧٦٧ واتە: قسەی جوان خێرە...

لە قسەی جوان و دەم و لەفزی شیرین ئەوەیە، کە موسوڵمان برا موسوڵمانەکەی خۆی بە جوانترین ناو، یان نازناو بانگی بکات، کە خۆی پێی خۆشە بانگی کەن پێی... چونکە ئەو کەسە لەوانەیە ناوێکی لە خۆی نابێت، کە خۆشەویست بووە لای، یان یادگارێکی خۆشی لەگەڵیدا هەبووە، یان وەکو ئەم سەردەمەی ئێمە ناوی خۆی گۆڕیوەو نایەوێت کەس بە ناوی ئەسڵی خۆی بانگی بکات، بۆیە پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێ: ((ثَلاثٌ يُصَفِّينَ لَكَ وُدَّ أخِيكَ تُسَلِّمْ عَلَيهِ إذا لَقِيتَهُ وَ تُوَسَّعْ لَهُ فِي المَجْلِسِ وَتَدْعُوهُ بِأحَبِّ أسْمَائِهِ إليهِ)) حاکم/حەسەنە/٥٨١٥ واتە: سێ شتن کە خۆشەویستی براکەت بۆ پاڵفتە دەکات: کە توشی بویت سڵاوی لێ بکە، کە هاتە کۆڕەوە جێی بۆ بکەرەوە و، بە خۆشترین ناو لای خۆی بانگی بکە...

گومانی تێدا نیە، کە ڕوخۆشی و دەم بە پێکەنینی و قسە خۆشی و زمان پاراوی و خۆش مەعشەریی، هەمویان هۆکاری سەرەکی ڕاکێشانی خەڵکین، بۆیە برایەتی دینیش مایەی پێکهاتن و بەردەوام بون و گەشەکردنن، چونکە دەم و چاوت ئاوێنەی بەرامبەرەکەتە، لە ڕوی تۆدا کەسایەتی خۆی لای تۆی تێدا دەبینێتەوە، دەم و چاو ناخی خاوەنەکەی دەخاتە ڕو، کە کەسانێك بە ڕوی خۆشەوە دەبینیت، کە بە ڕەفتاری جوان و قسەی جوانەوە لەگەڵتدا هەڵسوکەوت دەکەن، دەزانیت ڕێزو پلەوپایەت لە لای چەندە... ئەو هەرچەند بە سەرزارەکی وا ڕەفتارت لەگەڵ بکات و خۆی وا بنوێنێت، ئەگەر هەر بۆ موجامەلە ئەمەی دەکرد زوو دڵت هەواڵت پێ دەدا، کە ئەمە هەر قسەی لوس و خۆهێنانە پێشە، هەر خۆت دیقەت بدە سەدانی وا زمان لوست دیوە، کە هەر چەند خۆی هێناوەتە پێش، نەچۆتە دڵتەوەو زۆر زوو هەستت کردوە، کە هەر قسەیە، کەچی لە بەرامبەریشدا کەسانی وات دیوە، کە دەم و لەفزێکی وای نەبوە مونافەسەی ڕەوانبێژی ئەوی تریان بکات، خواخوات بووە زوو قسەکەی تەواو کات، کەچی چۆتە دڵتەوەو زانیوتە، کە سەر ڕاستەو دۆستایەتیەکەشی ڕاستگۆیانەیە... بەڵام گومانی تێدا نیە، کە هەر خۆت جاری وا هەبووە حوکمی کەسێکت داوەو ووتوتە: هیچی لەباردا نیە، بەڵام قسە خۆشە، کارەکەشت بۆ نەکات بە قسەی خۆش ڕایت دەکات... ئەمە بۆ دووڕوویەك ناڵێیت! چونکە دووڕوو لەگەڵ ئەم کابرایەی تردا، کە هەر قسەی هەیە جیایە... ئەویان موخەننەك و پیسە، ئەمیان پاکە، بەڵام لە باریدا نیە زیاتر پێشکەش کات...

لە بەرامبەریشدا سەیری ئەو کەسانەکە، کە مرو مۆچ و مۆنن، هەر کە ووتیان کارەکەت کەوتۆتە لای کەسێکی وا، ڕوگەشی لە تۆشدا دەمەیێت!! هەر لە لای خۆتەوە هەست بە قورسی ڕەفتارەکەی دەکەیت، حەز ناکەیت بیبینیت بەڵام ناچاریشیت!! کە چویتە لای هەر ئەوەندەی لا دەمێنێیتەوە، تا کارەکەت ئەنجام

دەدەیت، حەز ناکەیت نە قسەت بۆ بکات، نە قسەی بۆ بکەیت، کە قسەشت بۆ دەکات دەرونت خۆی بۆ قسەیەکی تیروتوانجی جەرگبڕانە ئامادە دەبێت، چونکە دەزانێت ئێستا قسەیەکی ناڕەوا، یان بە خۆت دەڵێت، یان بە کەسێکی تر، کە جێ ڕێزە لای تۆ... هەر نەبێ نەبێ غەیبەتی کەسێکی ترەو بۆت دەکات، کە تۆ ناتەوێت گوێت لێی بێت!!

لە هەردوو جۆرە قسەو ڕەفتارەکەداکەسایەتیەکان دەخوێنێتەوە، لە سیمایاندا کرۆکیانت بۆ دەردەکەوێت... هەرچەندە ناخی خەڵکی غەیبەو تەنها خوای گەورە دەیزانێت، بەڵام تۆش لە سیماو ڕواڵەتی خەڵکیدا، لە قسەو هەڵسوکەوتیاندا هەست دەکەیت، کە ناخیان چ کەسایەتیەکی لەخۆ گرتوە...

بۆیە پێویستە موسوڵمان هەمیشە ڕواڵەتی وەکو ناخی خۆی پاك و چاك بێت، پێویستە قسەی شیرین بێت، مادام دڵ و دەرونی پاکەو کینەو بوغزی تێدا نیە، حەیف نیە ڕوشی وا نەبێت، حەیف نیە ڕوشی هەمیشە گەش و دەم بە پێکەنین نەبێت؟! ئەگەر ئەمە مایەی سەرفرازی و چونە ناو دڵەوە نەبوایە، ئەگەر مایەی قازانجی دین و دنیا نەبوایە، ئەگەر مایەی زیاد کردنی دینداری نەبوایە، ئەگەر مایەو زەخیرە کردنی قیامەت نەبوایە، پێغەمبەری نازدارﷺ نەیدەفەرموو: (لا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ) موسلیم / ٤٧٦٠ واتە: (هیچ چاکەیە بە سوك تەماشا مەکە، با ئەوەش بێت، کە بە ڕوی خۆشەوە براکەت ببینیت...)

ئەمما سڵاو کردن، ئەوە هەر دروشمی ئیسلامەتیە، دابونەریتێکی سەرەکی باری کۆمەڵایەتی ئیسلامە، بۆیە ئیسلام بە فەرمان بە موسوڵمانانی ڕاگەیاندوە، کە خوی پێوە بگرن، تا سڵاو لە هەموو کەسێك بکەن، ئەوی دەیناسن و ئەوی نایناسن! بۆ وەڵامدانەوەش وای لەسەری فەرز کردووە، کە دەبێت سڵاوەکە، یان

وەکو خۆی یان چاکتر بسەنێتەوە! نابینیت خوای کردگارو کارجوان بەو گەورەییەی خۆیەوە ئەمە بە موسوڵمانان ڕادەگەێنێت کە: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴾ النساء / ٨٦ واتە: ئەگەر سڵاوتان لێ کرا، ئێوە بە چاکتر لەو وەڵامی سڵاوەکەی بدنەوە، یان هەر وەکو خۆی وەڵام بدەنەوە، چونکە بە تەئکید خوای گەورە لە هەموو شتێك دەپرسێتەوە!!

دەبێ زۆر لەوەش بە هۆشدار بین، کە لوت بەرزی و هەواو فیز، وامان لێ نەکات بێزمان نەیەت سڵاو لە هەندێك کەس بکەین، یان بڵێین با ئەو دەسپێشکەر بێت! یانِ ئەوە چیە، تا من سڵاوی لێ بکەم!! ئەمانە هەموی ئاسەواری نەخۆشی ناخن! موسوڵمان دەبێت زۆر لێیان هۆشدار بێت، نەکەوێتە شتی واوەو، دوایی زیاتر گومڕا ببێت بەوەی بەرگرییشی لێ بکات، ئەوەندەی جڵەو بۆ هەواو هەوەسی خۆی شل کات و بە دویدا بچێت... سڵاو کردنەکە لەو کەسەی ناتەوێت ڕەفتاری لەگەڵدا بکەیت ئاسانترە لەوەی خوانەخواستە دوچاری نەخۆشی خۆپەسەندی و هەڕاڵی(غرور) ولوت بەرزی ببیت! هەمیشە لە یادت بێت کە پێغەمبەری نازدار فەرموویەتی: ((لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ)) موسلیم/٨١ واتە: ناچنە بەهەشتەوە، تا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیشتان نابێت، تا یەکتریتان خۆش نەوێت، ئایا ئەو ڕێیەتان نیشان دەم، کە ئەگەر گرتانە بەر یەکتریتان خۆش بوێت؟! سڵاو لێك کردن لە ناو خۆتاندا بڵاو کەنەوە...

ڕاهاتن لەسەر ئەم ڕەفتارە جوانەو پاراستنی، یەکەمین سەرە داوی پەیوەندی بەهێزی کۆمەڵایەتیە، چونکە یەکەمین دیاردەی هەستی برایەتی و سەرەتاییترین نیشانەی سەر ڕاستی ئینتیمای دیندارانەیە، ئەمە جگە لەوەی بە تەئکید دڵ بردنەوەو بەلای خۆدا ڕاکێشانی بەرامبەرە...

**ج- باوەشکردنەوە و هەڵسوکەوت چاکی و خۆبەکەم زانی لە ئاستی براکەت:**

نەویکردنی باڵی بەزەیی و میهرەبانی و ڕەفتار و کردار و گوفتار جوانی لەگەڵ براکەتدا، دەرخستنی خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی لەنێوان ئیمانداران، لە هۆکارەکانی بەردەوام بونی برایەتییانە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ﴾ الفتح /٢٩ واته: (موحەممەد ئەوانە کراوی خوایە، ئەوانەش، کە شوێنی کەوتوون بەرامبەر بێ باوەڕان ئازا و توندن، بەبەزەیی و میهرەبانن لەنێوان خۆیاندا...)

هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾الشعراء/٢١٥ واته: (باڵی بەزەیی خۆت بۆ ئەو ئیماندارانەی، کە شوێنت کەوتون نەوی بکە). لە وەسفی ئەو ئیماندارانەشدا، کە لە هەڵسوکەوتیان ڕازیە دەفەرموێت: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ المائدە/٥٤ واته: ملکەچ و فەرمانبەردار و بەسۆزن بۆ ئیمانداران، بە عیزەت و بەهێزن بەرامبەر بە بێ باوەڕان...

بێگومان خۆبەکەم زانی لە نێو مسوڵمانان لە ئاستی یەکتری دەرگای دڵەکان بۆ حەق و ڕاستییەکان دەکاتەوەو دەبێتە هۆی گەشەکردنی سۆز و بەزەیی و بەردەوام بونی خۆشەویستی و موسوڵمانیشی پێ لای خوای گەورە بەرز دەبێتەوە... هەروەکو، کە پێغەمبەری ئازیزﷺ دەفەرموێ: ((مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلَّا عِزًّا وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ)) موسلیم /٤٦٨٩ واته: هیچ کاتێك خێر و چاکە لەماڵ و سامان کەم ناکاتەوە... بەندە هەرچەندێك لێبوردە بێت خوای گەورە بە عیزەت و سەربەرزتری دەکات، هەر بەندەیەك لەبەر خوا تەوازوع و خۆ بەکەمزان بێت حەتمەن خوای گەورە پلەی بەرز دەکاتەوە...

هەروەها دەفەرموێ: (إن اللّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لَا يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ وَلَا يَبْغ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ) ئەبو داود/حەسەنە /٤٢٥٠ واتە: خوای گەورە وەحی بۆ ناردم، کە خۆبەکەمزان بن، تا هیچ کەسێك شانازی بەسەر یەکێکی تردا نەکات و هیچ کەسێك زوڵم و ستەم لە کەسێکی تر نەکات...

هاوەڵان وەسفی پێغەمبەرمان بۆ دەکەن، کە چەند بێ فیز بووە و مامەڵەی جوان بووە، دەڵێن: سەرەتا بە سەلام لەگەڵ خەڵکیدا دەستی پێ دەکرد، کاتێك بە رێگەیەکدا دەڕۆیشت و کەسێکی دەدی گەورە بوایە، یان بچوك، ئەم خۆی لە رێگەی لا دەداو بۆی چۆڵ دەکرد! کاتێك تەوقەی دەکرد دەستی ڕانەدەکێشایەوە، تا کەسەکەی تر دەستی دەکێشایەوە. کە دەچوە هەر کۆڕ و کۆبونەوەیەك، لە کوێدا مەجلیسەکە کۆتایی دەهات لەوێدا دادەنیشت، کەل و پەل و پێویستی خۆی لە بازاڕ دەکری و خۆی هەڵی دەگرت، لە پوشی خورما نەعلی بۆ خۆی دروست دەکرد، خۆی پۆشاکەکانی خۆی پینە دەکرد، بەدەنگ کەس و کار و خێزانەکانیەوە دەڕۆیشت، نانی لەگەڵ خزمەتکارەکەی لەسەر سفرەیەك دەخوارد.

گومانی تێدا نیە کە ڕەوشت جوانی، ڕێگای بەدەستهێنانی دڵی خەڵکییە، پێش هەموو کەسێکیش بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەیە... پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: (أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا) ترمزی / حەسەن و سەحیحە/١٠٨٢ واتە: ئەو ئیماندارەی، کە لە هەموتان ئیمانی تەواوترە ئەوەیانە، کە ڕەوشتی لە هەموتان جوانترە... پەیوەست بون بە ڕەوشت جوانی لەنێوان مسوڵمان دا، ڕوناکی برایەتی دەژێنێتەوەو دڵەکان یەکدەخات و دەرگاکانی برایەتی دەکاتەوە.

سەبارەت بە سەردان لەبەر خاتری خوای گەورەو، چاوەدێری و بەئاگا بون لە حاڵی یەکتریی، ئەویش بەڵگەنەویستە، کە سەردان و هاموشۆی یەکتر، دیاردەیەکە

لە نەریتی کۆمەڵگای ئیسلامی, چونکە سەردان و هاتوچۆی خوشکان و برایان لەناو خۆیاندا ـ مادام لەبەر خاتری خوای گەورە بێت ـ هۆکاری پتەوکردنی پەیوەندی کۆمەڵی مسوڵمانن... ڕوحی کۆمەڵ بون، بەهێزو بەرفراوان دەکا... ئاسەواری کاریگەرو شوێنەواری درێژەکاتەوە... سۆز و بەزەیی بەهێزتر دەکات، پەیوەندی نێوان پتەوتر دەکات... ئەمەش تایبەت نییە بە پیاوانەوە، نا، بەڵکو بە گشتی لەناو پیاوان و ئافرەتانیشدا، هەر دەبێت ئەم نەریتە ببێتە ڕەوشتی ڕەسەنی کۆمەڵایەتی نێو موسوڵمانان... پێویستە ئافرەتە ئیماندارەکانیش لەبەر خاتری خوای گەورە، سەردانی خوشکەکانیان بکەن و یەکتریان خۆشبوێت و بەیەکەوە کۆببنەوەو، لەبەر خوای گەورە یارمەتی یەکتری بدەن...

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ عَادَ مَرِيضًا أَوْ زَارَ أَخًا لَهُ فِي اللَّهِ نَادَاهُ مُنَادٍ أَنْ طِبْتَ وَطَابَ مَمْشَاكَ وَتَبَوَّأْتَ مِنَ الْجَنَّةِ مَنْزِلًا))ترمزی/حەسەنە/١٩٣١ واتە: هەرکەسێ لەبەر خاتری خوای گەورە چوە سەردانی نەخۆشێك، یا بۆ لای برایەکی چوو، فریشتەیەك بانگی دەکات و پێی دەڵێ: چاکت کرد، چون و هاتنەوەکەت چاك بوو، وا ماڵێکت بۆ خۆت لە بەهەشتدا پێکەوەنا.

با برایان هەلی سەردان و هاتوچۆیان لەبەر خوا بقۆزنەوەو بیکەنە مایەی زیاد کردنی زەخیرەی قیامەتیان، با ئامۆژگاری چاکی یەکتر بکەن بۆ ئەنجامدانی کاری چاك و، پێکەوە هاوکار بن و خوێندن و دەرس و کۆمەڵکارییەکانیان پتەوتر کەن...

**د- داوا و تکاو شەفاعەتی چاکە بۆ براکەت لای مسوڵمانانی تر بکە :**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴾النساء/٨٥ واتە: (ئەو کەسەی داوا دەکا, داوایەکی چاك و باش، ئەوە بەشی ئەویشی تێدایە،

ئەو کەسەی شەفاعەت بکا بە شەفاعەتێکی خراپ، ئەوە بەشی ئەویشی تێدایە، خوای گەورە هەمیشەو بەردەوام چاودێرە بەسەر هەموو شتێکدا) لە فەرمودەیەکدا (أَبو بُرْدَةَ بْنُ أَبِي مُوسَى) لە باوکی یەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَاءَهُ السَّائِلُ أَوْ طُلِبَتْ إِلَيْهِ حَاجَةٌ قَالَ اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا وَيَقْضِي اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا شَاءَ)) بوخاری/١٣٤٢ واتە: ئەگەر پێغەمبەری خوایﷺ پرسیارکارێك، یان کەسێك بهاتایەو داوای شتێك، یا پێویستیەکی لیێ بکردایە دەیفەرموو: شـــــەفاعەت و تکا بۆ یەك بکەن، پاداشتی لەسەر وەردەگرن، خوای گەورە ئەوەی بیەوێت لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی دەیفەرموێت.

ئەم دەقانە جەخت لەسەر هاوکاری کردنی یەکتریی بە شەفاعەت و تکای چـاکە بۆ یـەکتریی کـردن دەکاتـەوە، چـونکە یارمەتیـدان، دەبێتـە مایـەی تۆوچـاندنی خۆشەویـستی و ڕوانـدنی گیـانی بەخـشندەیی... کاتێـك مـسوڵمانێك شـتێکی مسوڵمانێکی تری پێویستە، بۆ نمونە برایەك دەیەوێت بڕێك پارە لە برایەکی تر بـە قەرز وەربگرێت، خاوەن پارەکە، قەرزارەکـە بـاش ناناسـێت، یـان پێـشتر بـەهۆی شتێکەوە دڵی لێی ئێشاوە و ئێستا حەز ناکـا قـەرزی بـداتێ، یـان لەبـەر ئـەوەی پەیوەندی و هاتوچۆیان نەماوە، یان کەمە، یان بەهەر هۆیـەکی تـر بێـت، باشـترە قەرزارەکە کەسێکی مسوڵمان بدۆزێتەوە،کە خاوەن پارەکە باش بناسێت و شوێن و مەکانەت و قەدر و ڕێزێکی تایبەتی لای هەبێت، تا گوێی لـێ بگـرێ و تکاکـەی قبوڵ کات، ئەو برایەی، کە قەرزەکەی دەوێت بەم برایە دەڵێت، کە داوای بۆ بکات لای خاوەن پارەکە... ئەم کارەی کـە ئـەم مـسوڵمانەی سـێیەم بـە واسـیتەکاریی ئەنجامی دەدات، دەبێتە پاڵپشت بۆ برا قەرزارەکە، کە پارەکەی بە ئاسانی دەسـت بکەوێ، ئەوەشی هەر لەبەر چاو دەمێنێت، کە برا شەفاعەت کارەکـەی لـە پـێش چاوی خاوەن پارەکە لە مەکانەت و قەدر و ڕێـزی خـۆی بـە قەرزارەکـە داو، بـووە

کەفیلی! بووە جێ متمانەی، چونکە لە کاتی داوا لێ کردنی پارەکەدا، حەتمەن وەسفی قەرزارەکە دەکات و قسە و وتەی چاکی لەسەر دەڵێ... ئەمە هەر تکاو واسیتە بۆ کردنەکەیەتی، جا ئەگەر کابرای جێمتمانە پیاوەتیەکەی گەورە کردو لەگەڵ قەرزارەکەدا بچێت، ئەوە مانای وایە لە ڕەنج و توانا و کاتی خۆشی پێداوە! ئەگەر لەم أێگایەدا پێویستی کرد پارەیەکیش خەرج بکات، ئەوە وەکو ئەوەی، کە بۆ موحتاجەکەی سەرف کردبێت، ئەمەش پیاوەتیەکی ترە! تا زیاتر بە دڵ و گیان بەدەمیەوە بچێت و پێی خۆش بێت، کە ئەم کارەی بۆ بکات، ئەوە دەیسەلمێنێت کە خەمی ئەم برا موحتاجەی خۆی لە هەست و سۆزیدایەو دڵی پێی دەسوتێ و خۆشی دەوێت، بۆیە بە هەموو وزەیەوە کەوتۆتە جێبەجێ کردنی ئەو پێداویستیەی، کە بە خودی ئەم ناکرێت ئەگینا دەیکرد!

داوا و تکای باش لەنێو مسوڵمانان، سیمایەکە لە ڕوخسارە جوانەکانی یەك لاشەیی ئوممەتی موسوڵمانە، کە هەر یەك لە لای خۆیەوە بەشداری ئێش و ئازارەکانی دەکات و، هەر یەك لای خۆیەوە جۆرە وزەیەك بۆ هاوکاری و یارمەتی یەکتریی دەخەنە گەڕ... هەر لەبەر ئەمەشە، کە خوای گەورە و پێغەمبەری پێشەوا ﷺ جەختیان لەسەر شەفاعەتی چاکە کردۆتەوە، وەك ئەوەی جەختی لێ کردەوەو فەرموی: شەفاعەت بۆ یەك بکەن پاداشت وەردەگرن... یان کە داوا لە هاوەڵەکانی دەکا، شەفاعەت بۆ ئەو کەسانە بکەن، کە پێویستیان لەلای من هەیە (بە پێغەمبەری نازدار ﷺ خۆی) ئەگەر چی پێغەمبەر ﷺ هەر خۆی ئامادە بوو بۆ وەڵام دانەوەی ئەو داوایەیان، بەڵام ئەمە ئاڕاستە کردنێکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ هاوەڵانی و، پاشانیش بۆ ئێمە، کە نابێت قبوڵ کردنی جێبەجێ کردنی داواکە ببەستینەوە بە شەفاعەتەکەوە، واتە ئەگەر زانیمان قبوڵی دەکا داوای بۆ بکەین، ئەگەر زانیمان قبوڵی ناکا، داوای بۆ نەکەین! وەکو هەندێك کەس لەم زەمانەدا وا ڕەفتار دەکەن! چونکە جگە لەوەی، کە موسوڵمان لەسەر ئەم شەفاعەتە ـ

ئەنجامەکەی هەرچۆنێك بێت ـ پاداشت وەر دەگرێت، بەڵام ئەم تکا بۆ کردنە ئەرکی ئەم و مافی برا موحتاجەکەیەتی!! بۆیە پێویستە ئەم هەوڵی خۆی بدات و لەوە دڵ گران نەبێت، ئەگەر وەڵامی داواکەی نەدرایەوە... خۆ ئەوە بەڵگە نەویستە، کە هەموو کارێك بە قەزا و قەدەرەوە پەیوەستە! پێویستە باوەڕداریش ئەم قەزا و قەدەرە خواییە، بە ڕازی بونێکی تەواوە وەرگرێت.[1]

## ٣- ئامۆژگاری کردن و ڕاو بۆچوون وەرگرتن لە نێوان برایاندا:

خوای تاك و تەنها دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ العصر/١-٣

واتە: سوێند بە کاتی عەسر. بەڕاستی ئادەمیزاد زەرەرمەندو ڕەنج بە خەسارە. جگە لەوانەی باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوەی چاکەیان ئەنجامداوەو ئامۆژگاری یەکتریان کردوە، کە هەمیشە پابەندی حەق بون و ئامۆژگاری یەکتریان کردوە، تا هەمیشە خۆگرو ئارامگر بن . خاڵی سەرەکی ئامۆژگاریەکە، کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا باسکراوە (حەق و ئارامگرتن)ە، ئامۆژگاری یەکخواپەرستی و بەردەوام بون لەسەری و ئامۆژگاری پابەندبون، بە بەرنامەی ڕاست و حەق و، بە سوننەتی پێغەمبەردوەﷺ، ئارامگرتن لەسەر ئەم ڕێگایە، هەمووی بەنرخترین ئامۆژگارین، هەر بۆیە پێویستە لەسەر خواپەرستان لەناو خەڵکیدا هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئامۆژگاری کردن بدەن.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت: ئەو زانا خراپانەی لە ترسی دەسەڵات و قسەی خەڵکی، ڕاستی خواناسیی دەشارنەوەو لێیانی ون دەکەن، کە دەچنە پەنای دەستەڵاتدارانی بێ باوەڕ و سەرلێشێواو و ملکەچیان دەبن! چ تاوانێکی گەورە ئەنجام دەدەن .

---

١ـ عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني: الاخلاق الاسلامية ـ ب١ ل ٢٠٧ ـ ٢٠٨.

هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ پەیمان و بەیعەتیان لەسەر ئەوە دەدا، کە ئامۆژگاری موسوڵمانان بکەن، هەروەك جەریری کوڕی عبداللەی بەجەلی خوا لێ ی ڕازی بێت دەفەرموێ: (بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ) بوخاری/ ٥٥ واتە: بەیعەتم دا بە پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەنجامدانی نوێژو زەکاتدانو ئامۆژگاری کردنی هەموو مسوڵمانێك... پێغەمبەرﷺ ئامۆژگاری خستۆتە ڕیزی نوێژو زەکاتەوە، کە ئەم دوانە لە ئەرکانەکانی ئیسلامن، ئەمەش بەڵگەیە بۆ گەورەیی کاری ئامۆژگاری و بەرز و بڵندی پلەوپایەی ئەم کارە.

هەروەها ئەو فەرمودەیەی تەمیمی کوڕی ئەوس ﷺ ،کە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی :(الدِّينُ النَّصِيحَةُ قُلْنَا لِمَنْ قَالَ لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ) موسلیم/٨٢ واتە: دین ئامۆژگارییە، ووتمان بەرامبەر بە کێ؟ فەرموی: بەرامبەر بە خودا و کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەی و پێشەوایانی مسوڵمانان بەگشتی.[1] پێویستە ئامۆژگاری بە شێوازێکی پەسەند بێت، دوور

---

١ـ لە کتێبی(الوافي في شرح الاربعين النووية)لاپەڕەی ٤١-٤٥ لە شەرحی ئەم فەرمودەیەدا هاتووە :

- ئامۆژگاری بۆ خوای گەورە: واتە: باوەڕبون بە خواو نەهی هاوەڵ بۆدانانی ، هەروەها دانان نان بە هەموو سیفاتەکانی خوای گەورەو وەسفکردنی بە هەموو سیفاتە تەواو و کامڵەکان، بە شێوەیەك، کە هیچ کەم و کورتیەك نەدەیتە پاڵ خوای گەورەو خواویست بیت لە پەرستنیدا، هەروەها گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی و دورکەوتنەوە لە سەرپێچی، ئینجا خۆشویستن و ڕق لێبونەوەت لەبەر ئەو بێ، وەلائت بۆ ئەو کەسە ببێت، کە لە خزمەت دینی خوادایەو بەرانەتیشت لەو کەسانە بێت، کە دژی دینی خوا دەبنەوە... پەیوەست بونی موسوڵمان بەو شتانەی باسمان کرد لە هەموو ڕەفتارو هەڵسوکەوتێکیدا، هەمووی بە چاکە بۆ خۆی لە دونیا و ئاخیرەت دەگەڕێتەوەو بۆی هەژمارد دەکرێت، ئەم ئامۆژگاریە هەرچەندە پێغەمبەر فەرمویەتی بۆ خوایە، بەڵام گومانی تێدا نیە، کە مەبەستەکە ئەوەیە لەبەر خاتری ئەو زاتە پاکە بێت، ئەگینا خۆ خوای گەورە پێویستی بە نەسیحەتی ئامۆژگاریکاران نییە...

**لەشکاندنەوەی بەرامبەر یان سوك کردنی، بەڵکو بە شێوەیەکی جوانی وا کـە لـێ تێگەیشتن و پابەند بون پێوەی ئاسان کات، چونکە دەروونی مرۆڤ بە فیترەت حەزی**

---

- ئامۆژگاری بۆ کتێبەکانی: واتە باوەڕبون بە هەموو کتێبەکانی و ، داننان بەوەی قورئان کۆتای ئەو کتێبانەیەو شایەتە لەسەریان و ئامۆژگاری موسوڵمان بکرێت لەسەر قورئانی پیرۆز بەم شتانە: خوێندنەوەی بە تەجویدو بە دەنگی خۆش و لەبەرکردنی، بیرکردنەوە لە مانای ئایەتەکان و تێگەیشتن لێیان و ، هەوڵی فێرکردنی نەوەکانی موسوڵمانان بدەیت، زانینی ئەحکامەکانی و کارکردن پێیان، چونکە ئەگەر کاری پێ نەکەیت، هیچ خێرێك لە زانینی ئەحکامەکاندا دەست ناکەوێت...

- ئامۆژگاری بۆ پێغەمبەرﷺ: ئەمەش بە ڕاست زانینی پەیامەکەیەتی، بە باوەڕبون بە هەموو ئەو شتانەی پێغەمبەرﷺ هێناویێتی، جا ئەوانە بن، کە لە قورئان دان، یان ئەوانەی لە سوننەتدان، هەروەها خۆشویستنی و گوێڕایەڵی بۆ دەربڕینی، خوێندنەوەی مێژوی پاکی ژیانی و خۆپەیوەست کردن بەو ڕەوشت وئەدەبانەوە، کە پێغەمبەرﷺ هەیبوە، پەیوەست بێت بە سوننەتەکانیەوە، بە گفت و کردەوە، پەند و ئامۆژگاری لە ژیانیەوە وەربگرێت، هەوڵی بڵاوکردنەوەی سوننەتەکانی بدات و، بەرپەرچی ئەو تۆمەت و بوختانانە بداتەوە، کە دوژمنانی ئیسلام دەیخەنە پاڵی.

- ئامۆژگاری پێشەوایانی موسوڵمانان: ئەمانەش دەسەڵاتداری موسوڵمان و نوێنەرانیانن، یان زانایان و پیاوچاکانن، چونکە خێر لە ئومەتێکدا نیە، کە ئامۆژگاری دەستەڵاتدارانی نەکات، هیچ خێرێك لە حاکمێکیشدا نیە، کە زوڵم و چەوسانەوەی میللەتەکەی پێ ڕەوایە و دەمی ئامۆژگاریکاران دەگرێ و، گوێی لە ئاستی بیستنی ڕاستیدا دادەخات .

زانایان ئەرکێکی گەورەیان لەسەرە، کە ئامۆژگاری خەڵکی و فەرمانڕەوایان و کاربەدەستانە، ڕون کردنەوەی دینەکەیە بۆ هەمویان، ئەگەر بەهۆی هەڵوێستی چەوت و وەسفی درۆی ئەمانەوە دەستەڵاتداران بە زوڵم و چەوسانەوەدا ڕۆبچن، خوای گەورە لەمانیش دەپرسێتەوە!

- ئامۆژگاری بۆ مسوڵمانان بە گشتی: ئەمەش بە تێگەیاندنیان دەبێت لەو شتانەی، کە سودی هەیە بۆ ئاخیرەتیان پاشان دونیایان، واتە فەرمان کردن بە چاکە وبەرهەڵستی کردن لە خراپە لەنێو مسوڵمانان دان.

لە دەرخستنی عەیب و ناتەواویەکان نیە، هەروەها پێویستە ئامۆژگاریکار کـات و شێوازی گونجاو هەڵبژێرێت بۆ ئەنجامدانی کارەکەی، ئامۆژگاری کراویش پێویـستە بەدڵێکی فراوانەوە ئامۆژگاریەکە وەربگرێت، چونکە ئەمە لـە بـواری ئامۆژگـاری وەرگرتندا دابونەریتێکی جوانە.

لێرەوە دەردەکەوێ ئامۆژگاری لەنێوان براکاندا، بە نیازی پاك و پاڵنەری چـاك، بــە خێــرو چــاکە دەژمێردرێــت، مــادام بــۆ دەرخــستنی ڕاســتییە و پیــشاندانی هەڵەکانیەتی، بێ فێڵ و غەش لێکردنی، چونکە ئامۆژگاری دەچێتە بواری فەرمان کــردن بــە چــاکە و بەرهەڵــستی کــردن لــە خراپــەوە، موجامەلــەکردن لــە کــاتی ئامۆژگاریدا لەسەر حسابی دینو، بە نیەتی ئەوەی کەسی ئامۆژگاریکراو ڕانەکاتو گوێبگرێت، کارێکی وەرنەگیراوەو دوورە لە فەرمانی پێغەمبــەرەوەﷺ... ڕاســتە دەبێت لە کاتی ئامۆژگاریدا مرۆڤ دانایی و لێهاتوویی بەکار بهێنێت، بەڵام حەق و ڕاستی، دەبێت دەربکەوێت وبوترێت، بەتایبەت، ئەگەر ئەمــە لــە نێــوان کۆمەڵــە برایەکی لەیەك نزیکەوە بوو، کە پێویستە توانای ئەم کارە ئاسان تر بوبێت.

وەرگرتنی ڕاو و بۆچونی براکەت لەسەر کارەکــانی ڕۆژانــە، هــەر دەچــێتە ئــەم بوارەوە، جا ئیتر دەربارەی هەر کارێــك بێــت، وەك ژن هێنــان و کــچ بەشــوودان و خوێندن و سەفەرکردن و هتد...

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: ((وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ)) موسلیم/ ٤٠٢٣ واتە: (ئەگەر کەسێ داوای ئامۆژگاری لێ کردیت ئامۆژگار بکە).

## ٤ـ یارمەتیدان و هاوکاری کردنی یەکتریی لەسەر چاکەو چاکەکاریی:

موسوڵمانان هەموو یەك جەستەن، یەك بینان، هەر خشتێکی بەوانی دیکەیەوە بەندە، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت، کە دەبێ یارمەتیدانی یەکترییان لا فەرز بێت، چونکە ئەوان بەم هاوکاریی و یارمەتیدانەی یەکتریەوە، بون بە دیواری خشتی خشت، وەك خوای گەورە فەرزی کردوەو فەرمویەتی: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ﴾المائده/٢ واتە: یارمەتی یەکتری لەسەر چاکەخوازیی و پارێزکاریی بدەن، بەڵام لەسەر گوناح و دەستدرێژی یارمەتی و هاوکاری یەکتریی مەکەن... پێغەمبەری پێشەواش ﷺ دەفەرموێ: (الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ) بوخاری/ ٢٢٦٦ واتە: موسوڵمان بۆ موسوڵمان، وەکو دیواری کۆشك وایە، هەر یەکەیان ئەوانی تر دەگرێت، کە وای فەرموو، پەنجە پیرۆزەکانیشی تێك هەڵکێشا... ئەو کردارو رەفتارانەی دەچنە چوار چێوەی ئەم یارمەتیدانەوە، زۆر زۆرن، چونکە هەموو هاوکاریی و ئاسانکارییەك دەگرێتەوە، کە موسوڵمانێك بۆ موسوڵمانێکی تری بکات، بۆ ئەنجامدانی خواپەرستیەکان و گوێڕایەڵی شەرع و دەسگرتنی موسوڵمانان و، بە هانا هاتنی نەداران و دەست بەسەر هەتیودا هێنان و، دەیان شێوەی رەفتاری جوانی تری کۆمەڵکاریی و هاریکاریی... پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرموێ: ((السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ الْقَائِمِ اللَّيْلَ الصَّائِمِ النَّهَارَ)) بوخاری/ ٤٩٣٤ واتە: ئەو کەسەی بە پەرۆشی بێوەژن و دەستکورتانەوەیە، وەکو ئەو موجاهیدە وایە، کە لە پێناوی خوادا لە غەزادایە، یان وەکو ئەو کەسە وایە کە بەرۆژ رۆژوەوانەو بە شەویش خەریکی شەونوێژە! هەروەها دەفەرموێ:(وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ) موسلیم/٤٨٦٧ واتە: خوای گەورە لە یارمەتیدانی بەندەکەی خۆیدا دەبێت، مادام ئەو لە خزمەتی براکەیدا بێت...

گەورەترین یارمەتیدان و کاریگەرترین هاوکاریی و گرنگترین کۆمەڵکاریی موسوڵمان ئەوەیە، کە لە خزمەتی یەکتردا بن بۆ دەستەبەر کردن و پیادە کردنی دەوڵەتی ئیسلام و بەرز کردنەوەی ئاڵای خواویستی... هەروەها یارمەتیدانی یەکتریی لەسەر هەڵگرتن و گەیاندنەوەی بانگەوازی خوایی و، کۆڵی خیلافەتی ئیسلامی و ئاوەدان کردنەوەی زەوی بۆ خێرو خۆشی خەڵکی... ئەم کارە گەورانەش بەموسوڵمانی تەنها ناکرێت، کەس ناتوانێت ـ هەرچەند لێوەشاوە بێت ـ بە تەنها بە بەرهەم بگات، بۆیە یارمەتیدانی یەکتریی لەسەر ئەم کارە پیرۆزو ئەرکە شەرعیانە فەرزە، مەرجیشە هەوڵ بدەن لەسەر کۆمەڵێك ڕێساو بنەمای ڕۆشن و دیاری ڕێکخستن کۆببنەوەو بۆ ئامانجە هاوبەشەکەیان بکەونە کار...

برایانی بەڕێز! پێویستە لەسەرمان هیچ بەربەستێکی دەرونی و لەمپەرێکی ڕێی برایەتی و یارمەتیدان و هاوکاریی یەکتری لە نێوان خۆماندا نەهێڵین... پێویستە دڵ و دەرونمان، ڕاو بۆچونمان یەك خەین، وزەو ورەمان پێکەوە بەگەڕ خەین، تا بەشداربین لە ڕەنجی هێنانەوەی خیلافەتی ئیسلامیدا، کە وەکو پێغەمبەری نازدار مژدەی پێداوین[1] لەسەر بنچینەکانی دیدو هەڵوێستی خیلافەتی ڕاشیدە، بە پشتیوانی خوا دروست دەبێتەوە...

---

[1] حەدیسی سەحیحە، کە حوزەیفەﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری نازدارﷺ فەرمووی: ((تکون النبوة فيكم ما شاء الله أن تكون ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها ثم تكون خلافة على منهاج النبوة فتكون ما شاء الله أن تكون ثم يرفعها إذا شاء الله أن يرفعها ثم تكون ملكا عاضا فيكون ما شاء الله أن يكون ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها ثم تكون ملكا جبرية فتكون ما شاء الله أن تكون ثم يرفعها إذا شاء أن يرفعها ثم تكون خلافة على منهاج النبوة ثم سكت) ئەمەش ریوایەتی ئیمامی ئەحمەدەو شێخی ئەلبانی لە زنجیرەی سلسلة الاحاديث الصحيحة خۆیدا لە بەرگی یەکەم ژمارە(٥) بە سەحیحی داناوە .. واتە: پێغەمبەرێتی لە ناوتاندا دەمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی خوا حەز دەکات، ئینجا هەر کاتێك ویستی لایدەبات، پاشان خیلافەتێك دەبێت لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرێتی دەبێت، ئەویش لە ناوتاندا

## ٥ ـ سەرخستنی برا مەزڵومەکان:

ئەمانەو پاراستنی خوێن و ناموس و سامانیان و، هەوڵدان بۆ ڕزگار کردنی دیلەکان و بە هاناوە چونی ڕاوەدونراوان... لەسەر کردنەوەی هەموان، چونکە خوای گەورە فەرزی کردووە: ﴿وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ﴾ الانفال/٧٢ واتە: ئەگەر ئەو موسوڵمانانەی لە (دار الاسلام)ەکەی خۆتان نەبوو، هانایان بۆ هێنان، کە لەسەریان بکەنەوە، پێویستە لەسەرتان لەسەریان بکەنەوەو سەریان خەن... ئەم ئایەتە دەرهەق ئەو ئەعرابانە هاتە خوارەوە کە بەیعەتیان بە پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دابوو، بەڵام هیجرەتیان بۆ مەدینە نەکردبوو، بێگومان نەشچوبونە ڕیزی موشریکەکانەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی هانایان بۆ موسوڵمانان هێنا، کە بچن بە هانیانەوەو لەسەریان بکەنەوە، خوای گەورە پێی فەرمون، کە لایەنگیرییان فەرزەو دەبێ موسوڵمانان بیکەن... خۆ دیارە لەسەر کردنەوەی موسوڵمانانێك، کە وان لەژێر دەسەڵاتی کوفردا، کارێکی ئاسان نیە، هیجرەت و جیهادی دێتە ڕێ، ناسۆر و ژانی دێتە ڕێ، شەڕو شۆڕ و دسلێتی تری دێتە ڕێ!! بەڵام هەر دەبێ لەبەر خاتری پاراستنی مافی برایەتی بکرێت... جا بزانە ڕێزی برایەتی لای خوای گەورە چەندە؟!

ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: واتە ئەگەر ئەو ئەعرابانەی، کە کۆچیان بۆ لای ئێوە نەکردوە، لە شەڕێکی دینیدا هانایان بۆ هێنان، کە بچن بە

---

دەمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی، کە خوا حەزکات، ئینجا، کە ویستی ئەویش لادەبات، پاشان دەبێتە پاشایەتیەکی میراتگریی (ویراسی) ئەویشتان بەسەرەوە دەمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی خوا حەز بکات، ئینجا، کە خۆی ویستی ئەویشتان لەسەر لادەبات، پاشان دەبێتە دەسەڵاتدارییەکی ستەمکاریی سەپاو، ئەویشتان بەسەرەوە دەمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی خوا حەز دەکات، ئینجا، کە ویستی ئەویشتان لەسەر لادەبات، پاشان خیلافەتێکی دیکە دێت، کە ئەویش لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرێتیەکە دەبێت... ئیتر بێ دەنگ بوو...

دەنگیانەوەو لەسەریان بکەنەوە، دەبێ بچن و دوژمنیان لەگەڵدا بشکێنن، چونەکەتان لەسەر فەرزە، چونکە برای دینیتانن... (لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕراوەتەوە، تفسیر ابن کثیر ٣/٣٥٣)...

برایانی ئیماندار، برایانی خواویسست! ئەمە دەقێکی پیرۆزی قورئانە، لە ڕوانگەی ئەم ئەرکە خواییەوە بڕوانینە هەڵوێستی خۆمان، تا بزانین دەرهەق بە برایانی موستەزعەفی خۆمان، چەند کەمتەرخەمین؟! لە فەڵەستین، لە عێراق، لە ئەفغانستان، لە شیشان! لە هەموو شوێنێکی تری سەر ئەم زەمینە پان و پۆڕەی، جێی موسوڵمانی لێ نابێتەوە!! لەم دنیایەی، کە دەبینین چۆن ئەهلی کوفر گەلەکۆمەکێی نێو دەوڵەتییان دژی خواناسان کردووەو هەڵمەتی ڕیشەکێشکردنی موسوڵمانانیان کردۆتە پیشەی ڕۆژانەیان!!

﴿وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ﴾ الانفال/٧٢ واتە: ئەگەر ئەو موسوڵمانانە هانایان بۆ هێنان کە لەسەریان بکەنەوە، پێویستە لەسەرتان لەسەریان بکەنەوەو سەریان خەن... ئاوا بە ڕاشکاویی، بە شێوەیەکی گشتی، لەسەر کردنەوە بە گیان و ماڵ، پشتیوانی لێکردنیان بە خوێن و سامان و پێنوس و شێوازی تری لەسەر کردنەوەو بەرگریی لێکردنیان!!

لە جابری کوڕی عبدالله و ئەبو تەڵحەی ئەنساریەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) هاتووە، کە گوتویانە: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((مَا مِنْ امْرِئٍ يَخْذُلُ امْرَأً مُسْلِمًا فِي مَوْضِعٍ تُنْتَهَكُ فِيهِ حُرْمَتُهُ وَيُنْتَقَصُ فِيهِ مِنْ عِرْضِهِ إِلَّا خَذَلَهُ اللَّهُ فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ فِيهِ نُصْرَتَهُ وَمَا مِنْ امْرِئٍ يَنْصُرُ مُسْلِمًا فِي مَوْضِعٍ يُنْتَقَصُ فِيهِ مِنْ عِرْضِهِ وَيُنْتَهَكُ فِيهِ مِنْ حُرْمَتِهِ إِلَّا نَصَرَهُ اللَّهُ فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ نُصْرَتَه)) ئەبوداود/ ٤٢٤٠ و ئەحمەد/ ١٥٧٧٣ واتە: هەر موسوڵمانێك لەسەر موسوڵمانێکی دیکە نەکاتەوەو لەو کاتەدا پشتی بەردا، کە ڕێزی تێدا دەشکێنرێت و ئابڕوی تێدا لەکەدار

دەکرێت، خوا ناهێڵێت بەسەریەوە بچێت، خوای گەورە لە شوێن و کاتێکدا پشتی بەر دەدات و لەسەری ناکاتەوە، کە پێویستی بە کەسێك بێت سەری خات و، پشتی بگرێت... هەر موسوڵمانێکیش لەسەر موسوڵمانێکی دیکە بکاتەوەو لەو کات و شوێنەدا سەری خات، کە ڕێزی تێدا دەشکێنرێت و ئابڕوی تێدا لەکەدار دەکرێت، خوای گەورە (بۆی هەڵدەگرێت و) لە کات و شوێنێکدا پشتی دەگرێتەوەو لەسەری دەکاتەوە، کە زۆری پێویست بە کەسێك بێت هەر لایەکی لێ بکاتەوە!! هەروەها دەفەرموێ: ((الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) بوخاری/ ٢٢٦٢ واتە: (موسوڵمان برای موسوڵمانە، ستەمی لێ ناکات، تەسلیمی کەسانی دوژمن، یان ناحەزی ناکات، هەر کەسێك لە هەوڵی جێبەجێ کردنی پێداویستی براکەیدا بێت، خواش لە هەوڵی جێبەجێ کردنی پێداویستی ئەودا دەبێت، هەر کەسێك نارەحەتیەك لەسەر موسوڵمانێك لادات، خوای گەورەش نارەحەتیەکی لە نارەحەتیەکانی قیامەت لەسەر ئەو لادەبات، هەر کەسێك عەیب و عاری موسوڵمانێك داپۆشێت، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا عەیب و عاری ئەو کەسە دادەپۆشێتەوە!!) هەروەها دەفەرموێ: ((أعِينوا المظلومَ)) ئەحمەد/١٨٥٦٩ واتە: یارمەتی مەزڵوم بدەن . یان دەفەرموێ: ((انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْصُرُهُ إِذَا كَانَ مَظْلُومًا أَفَرَأَيْتَ إِذَا كَانَ ظَالِمًا كَيْفَ أَنْصُرُهُ قَالَ تَحْجُزُهُ أَوْ تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ فَإِنَّ ذَلِكَ نَصْرُهُ)) بوخاری/ ٢٢٦٤ واتە: (براکەت بە زاڵمی و مەزڵومی سەرخە! کابرایەك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە دەزانم، کە مەزڵوم بوو دەبێ سەری خەم، بەڵام کە زاڵم بوو چۆن سەری خەم؟! فەرموی: ڕێی زوڵمی لێ بگرەو مەهێڵە زوڵم کات، ئا ئەوە سەرخستنەکەیەتی...).

موسوڵمانان مافیان یەکە، خوێنیان یەکە، ناموسیان یەکە، سامانیان یەکە، دەبێ بە هەموو شێوەیەك یەکتریی بپارێزن، بەرگریی لە یەکتری بکەن، لەسەر یەکتریی بکەنەوە، نابینیت پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرموێ: ((الْمُؤْمِنُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ))ئەننەسائی/سەحیحە/٤٦٥٣ واتە: (موسوڵمانان خوێنیان هاوکوفی یەکە (یەکسانن) هەموویان یەکدەستن لەسەر غەیری خۆیان، ئەوی لە هەموان کەمترە لە خزمەتی ئەوانی دیکەدایە... راڤەوانانی فەرمودە لە باسی ئەوەدا دەڵێن: یەکدەستن: واتە هەموویان پێکەوە یەك هەڵوێست بەرامبەر دوژمنیان دەوەستن و، لە ناو خۆیاندا هاوکاری یەکتریی دەکەن بۆ سەرخستنی دینەکەیان بەسەر هەموو دین و ڕێبازو میللەتێکی دیکەدا، هەر وەکو بڵێیت یەك دانە دەستەو، دەبزوێت و یەك کار ئەنجام دەدات![1]

کەواتە برا هاودینەکەم، خواویستەکەم ،ئەوە بزانە لە هەر جێیەك دەستدرێژی کرایە سەر موسوڵمانێك، ئەوە بزانە، کە دەستدرێژی کراوەتە سەر تۆ، کە خوێنی ئەو دەڕێژرێت، ئەوە خوێنی تۆشە دەیڕێژن، کە ناموسی ئەو دەتکێنن و خوشك و دایکی ئەو هەتك دەکەن، ئەوە هەر ناموسی تۆیەو کەوتۆتە بەر دەستی دوژمنان، هەر کەس سامانی براکەتی زەوت کرد، ئەوە سامان و موڵك وماڵی تۆی زەوت کردووە، دە ڕێی لێ بگرەو مەیهێڵە... دە لەگەڵ براکانتدا بسازێ و هێزیان لەگەڵدا پێکەوە نێ تا یەکتریی بپارێزن... ئای کە خۆشە کەس پێتان نەوێرێت!! بەڵام هەی داخ! وای کە زریکەی زارۆکی بێ تاوان و هاواری ژنی موسوڵمانی موحەجەبە بە ژانە، کە نازانن ڕووی هاواری بێ دەسەڵاتی بکەنە چ کۆمەڵە مرۆڤێك؟!

---

١ ـ شرح سنن النسائي للسيوطي لە ڕاڤەی فەرمودەی ژمارە (٤٦٥٣) .

مێژوو چەند جارێ ئەم شیعرو سرودەی بۆ لێداینەوە:

رُبَّ وا مُعْتصمَاهُ انْطَلَقتْ. . . . . . . . مِلْءَ أفـواهِ الصَّبَايا اليُتّـمِ

لامَسَـتْ أسْمَاعَهُم لكِنَّهَا. . . . . . . .لَمْ تُلامِسْ نَخْـوَةَ الْمُعْتَصِمِ[١]!

بەڕێزان، خواویستان، ئەمانە هەموی دەقی پیرۆزی ئەم دینەن، هـەموو بنـبڕن، کە هی خواو پێغەمبەری خـوانﷺ، هـەموو ماناکانیـان ڕۆشـنەو، ئـەو مانایانـە زیاتریان لێ نافمرێتەوە، کە هێنامانەوە، هەموی داوا دەکات موسوڵمانان لە نـاو خۆیاندا سەرخستنی یەکتریی بکەنە فـەرزێکی خـوایی، بیکەنـە ئـەرکی ڕۆژانـەی سەرشانیان، تا لەسەر یەك یەکی موسوڵمانان بکەنەوە...

ئەم دەقانە ڕووەڕووی هەموو ئەو موسوڵمانانە دەبێتـەوە، کـە ئێـستا لـە نـازو نیعمەتدان، لە ئازادی و سەربەستیدان، لـە چـێژی ژیـانی ئاسـودەییدان، لـە بـیری پارەسەریەکناندان و براکانیشیان دیلن، زیندانن، لەژێر قامچی جەللاداندان، ماڵ و منداڵیان بێ نازن، دەسکورت کەوتون، چاوەڕوانن کەسـێکی موسـوڵمانی جـوامێر لایەکیان بـە لادا بکاتـەوەو دڵنـەواییان کـات و یارمەتیـەکیان پـێ بگـەێنێت... نابینیت پێغەمبەری پێشەوا هیچ وزەیـەك ناهێڵێتـەوە لـە مەیدانێکـدا نەیخەیتـە کـــار، کـــە دەفـــەرموێ: ((فُكُّـــوا الْعَـــانِيَ وَأَطْعِمُـــوا الْجَـــائِعَ وَعُـــودُوا الْمَرِيضَ))بوخاری/٢٨١٩ واتە: دیل ڕزگار کەن، برسی تێر کەن، سەردانی نـەخۆش بکەن... چەند هەزار موسوڵمان هەن، کە ئێستا پێویستیان بە یارمەتی تۆهەیە...

---

١ـ ئەرێ چەند جار هانای ئەرێ هۆ موعتەسەم پڕ بە زاری کیژۆڵـەی هـەتیوو هاتـە بـەر گوێ؟!

.. بەر گوێی هەموویان دەکەوت!! بـەڵام جارێـك بـەر جـوامێریی موعتەسـەمێك هـەر نەکەوت!

له موجاهیدان و کەمئەندامـەکانیان، لـە زینـدانیان و کەسـوکاریان، لـە زارۆکـی هەتیوی چاوگەشی بێ کەسیان، لە بریندارو نەخۆش و ڕەشـوڕوتان؟!! ئـەم هـەموو ناسۆره لە پێناوی چیدا دەچێژین؟! مەگـەر لەبـەر خـاتری خـوا نیـەو لـە پێنـاوی بانگەوازەکەی ئەوو سەروەریی شـەرعەکەی ئـەودا نیـە؟! مەگـەر بـۆ هێنانـەوەی خیلافەتی ڕاشیده نیە، کە هەمو ئازادی و سەربەزی و ئاسودەیەکی پێوەیـە؟! دەی مەگەر ئەرکی سەرشانمان نیە، کە یارمەتی یەکتریی لەسەر خێرو چاکە بـدەین، لـە پێش هەموشیانەوە کۆمەڵکارییەکی ڕەسەن، کە وزەکانی هەمومان، ژیرانـە بخاتـە گەڕ؟! تا هێزێکی وامان لێ پێك دێت دیلەکانمان پێ ڕزگار بکرێت، زیندانیانمان پێ ئازاد بکرێت؟!

برای دیندارو جوامێرم، بە تایبـەتی حـەز دەکـەم بیرخـستنەوەیەکی تایبـەتیت بخەمە بەر دەست، بەو هیوایەی سودی بۆ قیامـەتی خـۆت و دنیـاو قیامـەتی بـرا زیندانیەکانت هەبێت، مەڵێ: جا من چیم پێ دەکرێت؟! ئەوەی من بـۆت پێـشنیار دەکەم، لانی کەم هەندێکیت پێ دەکرێت:

- ڕێکخراوێکی مافی مرۆڤ دروسـت کـە، یـان ڕێکخراوێـك بـۆ ئـازادی دیـل و زیندانیان دروست کەو بە دوای کێـشەکانیانەوە بـە، نـاوی خۆیـان بـە ڕێکخـراوی جیهانی بناسێنە، ناوی جەللادەکان بزڕێنە، هەوڵی ڕزگار کردنی دیـل و زینـدانیان بدە، تا ئازاد دەبن، چیت بۆ ئازاد کردنیان هەڵسوڕا، درێغی مەکە، ئەگەر بە هێـز نەبیت ناکرێت، پێکیەوە نێ، کۆمەڵکارانە دیراسەی پێکەوەنانی ئـەو هێـزە بکـە، کە ئازادی و سەربەرزیی بۆ ئەو پیاوە شەریفە خواویستانە دێنێتەوە دەست...

- ڕێکخراوی کۆمەك دروست کە، هەوڵی کۆکردنـەوەی یارمـەتی مـاددی بـدە بۆیان، زەکات و خێرو خێراتی موسوڵمانانیان بە ڕێکوپێکی پێ بگەێنە، ئەمـە زۆر گرنگە، لە ڕووی دەرونیەوە ناهێڵێت بـڕوخێن، هەسـت بـە بـێ کەسـی ناکـەن...

گوتەکەی ئیمامی مالیك بیری موسوڵمانان بخەرەوە، کە دەیگوت: پێویستە لەسەر موسوڵمانان دیلەکانیان قوتار کەن، ئەگەرچی سەروەت و سامانی هەموشیانی بوێت (تەفسیری قورتوبی/ ئایەتی: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾ البقرە/١٧٧... یان گوتەی ئیبنو عابدینیی حەنەفی، کە دەڵێ: ئەگەر ئافرەتێك لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی موسوڵمانان بە دیل بگیرێت، قوتار کردنی لەسەر شانی ئەهلی ڕۆژئاواشیان فەرز دەبێت... (حاشية ابن عابدين (٣٠٦/٣))...

ـ هەمیشە لە یادت بن، دوعای خێریان بۆ بکە...

ئەوەت لە بیر بێت و بیر بخەرەوە، کە ژمارەی موسوڵمانانی خواویست و پاك، ڕۆژانە لە زیندانی تاغوتاندا زیاد دەکات!

دوای ئەم بیر خستنەوەیە، ئایا خاوەن کەرشە نەوتیەکان و عەرشە ئاڵتونیەکان،کە کۆشك و تەلاریان پڕ کردوە لە جەواریی و کەنیزەکی ئەسمەر و سپی، کە شەوو ڕۆژ لەسەر سامانی ئەم ئوممەتە دەلەوەڕن، ئایا شەرمێك دەیانگرێت و غیرەتێکیان تێدا ماوە بۆ ئەو دیل و زیندانیانە بجولێ ؟! شەرمی ئەوەش ناکەن و تەریق نابنەوە، کە خۆشیان بە ئەهلی یەکخوا پەرستی(التوحيد) پارێزەرانی تەوحید دەزانن؟!

خوایە، ئەی پەنای لانەوازان، پشتی پەرتەوازان، هیوای دیل و ئومێدی هەستی زەلیل و جێ هانای کۆست کەوتوو جەرگ سوتاوی موسوڵمانان، ڕوی ڕەحمەتت لە موسوڵمانان بە تایبەتی لە زیندانیەکانیان کەو بەزەیی خۆتیان بەسەر دا بڕێژەو بە لوتفی خۆت لەگەڵیاندا بەو بە دەسەڵاتی خۆت رزگاریان کە... تا ئەو کاتەش هەر خۆت سەرپەرشتی خێزان و ماڵ ومنداڵی بێنازیان بە...

خوایە ئێمەش بکە بە ئامرای قەدەری خۆت و سەرکەوتنێکمان بۆ ئەم ئیسلامە لە تەمەنی خۆماندا پێ بهێنە دی... ئامین...

## ٦ ـ ئەرکە کۆمەڵایەتیەکان:

ئیسلام کۆمەڵێ ئەرکی زۆری کۆمەڵایەتی لەسەر موسوڵمان داناوە، کە دەبێت بۆ بەردەوامبونی برایەتی دینیی و پەرەسەندنی خۆشویستنی یەکتریی و هاریکاری کردنی یەکتریی ئەنجام بدرێن... وا ئاماژەیەکی خێرا بە هەندێك لەوانە دەکەین :

### أ ـ وەرگرتنی دیاری و پاداشت دانەوە لەسەری:

ئیسلام بایەخی بەوە داوە، کە موسوڵمانان لەناو خۆیاندا دیاری بدەنە یەکتر، تا خۆشەویستی و متمانە لە نێوانیاندا زیاتر ببێت و برایەتیە دینیەکەیان پتەوتر ببێت، ئەمەش هۆکارێکی کاریگەرە، بۆیە پێغەمبەری نازدارﷺ دەفەرموێ:((تَصَافَحُوا يَذْهَبَ الْغِلُّ وَتَهَادَوْا تَحَابُّوا وَتَذْهَبْ الشَّحْنَاءُ)) ئیمامی مالیك/سەنەدەکەی حەسەنە/١٤١٣ واتە: تەوقە لەگەڵ یەکتری بکەن، چونکە تەوقەکردن کینە لادەبات، دیاریش بدەنە یەکتریی، خۆشەویستیتان بۆ یەك زیاد دەبێت و تورەیی ناکۆکیەکانتان ڕادەدات... بۆ کاریگەریی زیاتریش، دەتوانیت بۆنەی تایبەتی بەرامبەرەکەت هەڵبژێریت، وەك بۆنەی هاوسەرێتی، دەرچون، گەڕانەوە... هتد .

لە ئادابی دیاری وەرگرتنەکە، ئەوەیە پاداشتی بدەیتەوە، عائیشە خان (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا) بوخاری/ ٢٣٩٦ واتە: پێغەمبەرﷺ کە دیاریەکیان بۆ دەهێنا وەری دەگرت و سوپاسی نێرەرو هێنەری دەکردو، پاداشتی بە دیاریەکی لای خۆی دەدایەوە! ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێ: لە جیاتی دیاریەکە، دیاریەکی تری دەناردەوە، کە لانی کەم هاو نرخی دیاریەکە بوو، کە بۆی نێررابوو! لەمەوە مالیکیەکان گوتویانە، کە

دیاری ناردنەوە لە پاداشتی وەرگرتنیدا واجبە بە تایبەتی، ئەگەر لە هەژارەوە بۆ دەوڵەمەند چوبوو... مەبەستی ئیمامی ئیبنو حەجەر لەوەدایە کە ئەوە خووڕەوشتی پاکی پێغەمبەر بوە، کە هەمیشە لەگەڵ وەرگرتنی دیاریەکەدا، سوپاسی خاوەن و هێنەرەکەی کردوەو دەسبەجێ، یان دواتر دیاریەکی گونجاوی وەکو ئەوەی خۆیان، یان زیاتری بۆ ناردونەتەوە، بۆیە دەبێت لانی کەم نرخی دیاریە وەڵامەکە بە قەدەر دیاریە نێرراوەکە ببێت... ئینجا ئیمامی ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەمە ڕای کۆن و نوێی شافیعیشە... حەنەفیەکانیش هەمان ڕایان هەیە، بەڵام گوتایانە: ئەگەر دیاریەکەی بە ئومێدی پاداشت و دیاریەکی بەنرختر نارد، باتڵە، چونکە دەکەوێتە خانەی جۆرێك لە فرۆشتنی نەزانراوەوە! دیاری ناردن بەخشینە نەك بازرگانی، لە شەرعیشدا کڕین و فرۆشتن لەگەڵ بەخشیندا جیاوازە، هەر وەکو، کە دیاری و خێریش جیاوازیان هەیە... (فتح الباري: لە شوێنی ڕاڤەی حەدیسی ناوبراو)...

**ب ـ قبوڵ کردنی دەعوەت:**

ئەگەر موسوڵمانێك برا موسوڵمانەکەی تری بانگهێشتی دەعوەتێکی کرد، خواردن بێت، یان هەر پێکەوە دانیشتن، دەبێت بە دەنگیەوە بچێت، چونکە مافێکی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان ئەوەیە، کە ئەگەر دەعوەتی کرد، وەڵامی بداتەوە، وەکو پێغەمبەری ئەکرەمﷺ فەرمویەتی: (حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ رَدُّ السَّلَامِ وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ) بوخاری/ ١١٦٤ واتە: مافی موسوڵمان لەسەر موسڵمان پێنجن: وەڵامدانەوەی سلاو کردن، سەردانی نەخۆش، شوێن جەنازە کەوتنی بۆ گۆڕستان، قبوڵ کردنی دەعوەتی، دوعا بۆ کردنی کاتی پژمینی...

گومانی تێدا نیە، کە هەر یەك لەمانە ڕۆڵی ئیجابییان هەیە لە بەهێز کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی موسوڵمانان و،پەرەپێدانی متمانەو خۆشەویستی نێوانیان و،

بەهێز کردنی گیانی برایەتییان...بۆیە بەدەم دەعوەت چونی موسولّمانەوە، مـاف و ئەرکە و، پێویستە بهێنرێتە دی، نەك رِەفز بکرێتەوەو گوێی پێ نـەدرێت... ئـەوی دەعوەتەکەی بۆ کردویت، مەبەستێتی، کە جەمسەری پەیوەستیەکی بـەهێزت پـێ بگەێنێت، کە جەمسەرەکەی تری بە خۆیەوە بەندە...

**ج ـ سترکردنی موسولّمان:**

واتــە داپۆشــینی عــەیب وعــاری و ســرِ هەڵنــەماڵینی، پێغەمبــەرﷺ دەفەرموێ:((من ستر مسلماً ستره الله يوم القيامة)) موسلیم / ٤٦٧٧ واتـە: هـەر کەسێك نهێنی موسولّمانێك داپۆشێت، خوای گەورە لە قیامەتدا لەخۆی دەگرێت و نهێنیـەکانی دادەپۆشـێت! تـەنها سـاتێك بـیر لـەوە بکـەرەوە، کـە تـۆ عـەیبی موسولّمانێکت داپۆشیوەو خوای گەورەش لـە رِۆژی قیامەتـدا، کـە هـەر هـەموو مەخلوقات دەتبینن، تۆ ستر دەکات، ئەم هاندانـە گەورەیـە بۆچـیە؟! بـۆ ئەوەیـە موسولّمانان نەکەونە ئابرِو بردنی یەکتری، نەکەونە باسو خواسی یـەکتریی و شـوێن عـەیب و عـاری یـەکتریی نەکـەون، موسـولّمان، کـە بـرا موسـولّمانەکەی خـۆی خۆشویست، چۆن دەهێڵێت یەکێکی تر باسی بکات؟! چ جای ئـەوەی خـۆی کـەمو کورتیەکانی ئاشکرا بکات و ناوی بزرِێنێت!! برِوانە ئـەو پاداشـت دانـەوەی خـوای پەروەردگار، کە هەر لە توخمی کارە چـاکەکەی موسـولّمانەکەیە، ئـەم لـە دنیـادا لەبەر خاتری خوا نهێنی موسـولّمانان دەپارێزێـت، خـوای گـەورەش لـە قیامەتـدا کەموکورتی ئەم دەپارێزێت!! چ شتێکی گەورەیە، کەسێك خوای زاناو توانـا سـتری کات، کێ دەتوانێت سرِی هەڵماڵێت؟! بە پێچەوانەشەوە (وەکو لە فەرمودەی تـردا هاتوە) کەسێك سرِی موسولّمانێك هەڵماڵێت، بۆ کوێ دەچـێت؟! چـۆن لـە دەسـت خوای گەورە دەرباز دەبێـت، لـە رِۆژی قیامەتـەدا، کـە خواخوایـەتی نهێنیـەکانی دەرنەکەون، خوای زاناو توانا ئابرِوی دەبات و هەموو نهێنیەکانی دەخاتە بەر چاوی خەڵکی!! چ ئابرِوچونێکە؟!

پۆشینی عەیب و عاری موسوڵمان، لە سیفەتی جوامێریی و پیاوەتیە، بۆیە کە موسوڵمانێك شتێکی خراپ لە برا موسوڵمانەکەی خۆی دەبینێت، کە دەبینێت کەوتۆتە گوناحێکەوە، ناڕوات لێی لە هەڵلاداو لە ناو خەڵکیدا باسی بکات، بەڵکو بۆی دەپۆشێت، تا هەستی تۆبە کردنی تێدا بەهێز کات، کەوا ئەمجارە ئەو نوقسانیەی کەوتە بەر چاوی فلان کەسی موسوڵمانی چاك و ئابڕوی نەچوو، خۆ هەموو جارێکی تر هەر وا نابێت، ئەوە خوای میهرەبانە بۆی داپۆشیوە، ئاخر ئەگەر بەردەوام بێت، خوای گەورە ئەو داپۆشینەی لەسەر لا دەبات و حەسودێکی دەمشڕی توش دەکات، کە لە هەرچی شوێنێك ئەم جێی ڕێز بێت، ئەو لەو جێیەدا باسی خراپەکانی دەکات!!

موسوڵمان لە پۆشینی کەمو کورتی ونهێنیەکانی موسوڵمانان پاداشت وەردەگرێت، بەڵام لە سڕ هەڵماڵینیان چ سودێك دەکات؟! هیچ... مەگەر مەسەلەکە پەیوەندی بە ئەمنیەتی موسوڵمانانەوە هەبێت، یان پەیوەندی بە چەواشەکردنی کوفرەوە هەبێت، هەر کەسێك حەز بە هەڵماڵینی نهێنی موسوڵمانان بکات، ئەوە حەتمەن خراپەخوازەو دەیەوێت موسوڵمانان نوشوستی تریان بەسەردا بێت، ئەمە جگە لەوەی، کە ئەو ڕەفتارە خۆی لە خۆیدا سیفەتێکی لاسەنگیە! دەنا کێ هەیە حەز بەوە بکات برا موسوڵمانەکەی خۆی توشی سوکایەتی ببێت، کێ هەیە حەز کات پلەو پایەی خۆشەویستێکی خۆی دابەزێت؟! مەگەر کەسێك کە توشی گرێ و گۆڵی دەرونی بوبێت... خوا لاماندا... خوای گەورە زۆر بە سەختی بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە، کە حەز بە بڵاو بونەوەی خراپەکاریی و داوێن پیسی دەکەن لە ناو موسوڵماناندا و هەڕەشەی سزای سەختیان لێ دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَـٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾النور/١٩ واتە: ئەو کەسانەی، کە حەز

دەکەن خراپەو داوێن پیسی لە ناو موسوڵماناندا تەشەنە بکات، لە دنیاو قیامەتدا سزای زۆر بە ژانیان دەبێت... خوا دەزانێت و ئێوە نازانن[١]...

### د ـ ئەگەر پژمی و سوپاسگوزاری خوای کرد، دوعای ڕەحمەتی بۆ بکە:

ئەمە ئەدەبێکی زۆر بەرزی کۆمەڵایەتی ئیسلامەتیە،کە نیشانەی زەوقی ساغ و هەستی بەرزی موسوڵمانانە، کە کۆڕو کۆمەڵییان پڕە لە ئەدەب و ڕەزانەت و پارسەنگی، جگە لەوەی نیشانەی ئەوەیە، کە موسوڵمان هەمیشە بۆ هەل دەگەڕێت، تا دوعای خێر بۆ برا موسوڵمانەکەی بکات و، وشە یەکی ناسك و جوانی ئاڕاستە کات، کە پێی دڵخۆش دەبێت!! کە لە بەرامبەریشیدا حەتمەن داوە دەزویەکی تری هەست و سۆزو خۆشەویستی لەگەڵ دڵسۆزیەکەیدا بۆ دەهۆنێتەوە، ئەوەش دەبێتەوە بە هۆکارێکی دیکەی زیادکردنی برایەتی!!

ئەوی دەپژمێت و هاودەنگانی کۆڕو کۆمەڵەکەی پێی دەڵێن (یرحمك الله: واتە خوا بەزەیی پێتدا بێتەوە) هەست دەکات، کە هەموو حاڵەتێکی خۆش و ناخۆشیی، جێ بایەخی هاودەنگەکانێتی، کە ئاوا لەم ڕوداوە سوکەشدا، کە بەسەریدا هاتووە دوعای بۆ دەکەن و بە خەمیەوەن، تا هیچی لێ نەیەت، ئەویش بە بایەخەوە پێیان دەڵێتەوە: (یهدیکم الله و یصلح بالکم: خوا ڕێنماییتان بکات و هۆشتان ڕێکخات (کارتان ڕاست بهێنێت)!

---

١ـ سەیید قوتب لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ ئەو کەسەی، کە باسی ئافرەت و پیاوی داوێن پیس لە کۆڕو کۆمەڵی موسوڵماناندا بکات، کە گوایە لە فلان ناوچە فلان داوێن پیسی لێیە، هەر دەچێتە ڕیزی ئەو کەسانەوە، کە ئەم سزایە دەیانگرێتەوە، چونکە باس کردنی شتی وا لە کۆڕو کۆمەڵی موسوڵماناندا بە فزولێتی، سەر دەکێشێت بۆ بەدوادا چون و کەوتنە دوای!!

ئەم زیادەیەی دوعاکە نوکتەیەکی خۆشی تێدایە کە لە وشە عەرەبیەکەدا دەردەکەوێت (یُصلح بالکم: هۆشتان ڕێك خات)واتە وەکو، کە ئێوە لە گەرمەی سەرقاڵ بونی خۆتاندا هەر هۆشتان لە تەندروستی و باری دەرونی من بوو، دەی سا خوای گەورە هەمیشە هۆشتان زیت و زرنگتر کات، تا هەمیشە هۆشتان لەخۆتان و لە براکانی ترتان بێت!!

## هـ ـ گومان باشی و سینە پاکیی:

بە ڕەفتاری بەرزو جوامێریی موسوڵمان ئەوەیە، کە گومانی باش بە براکانی ببات و ڕەفتارو گوفتارەکانیان بە دیوی جوانیدا بۆ لێك داتەوە... هەروەها وا سەیریان کات، کە جێ گومانی باشی ئەون، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ بەرهەڵستی ئەوەی لێ کردوین گومانی خراپ بە براکانمان بەین، ئەوﷺ گومانی خراپی، بە درۆترین قسە ناوزەد کردوە، تا بە دزێوو ناقۆڵا ببینین و تەنەفورمان لێی هەبێت و.. وەکو دەفەرموێ: ((إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيث وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا تَحَسَّسُوا وَلَا تَبَاغَضُوا وَكُونُوا إِخْوَانًا وَلَا يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَنْكِحَ أَوْ يَتْرُكَ)) بوخاری/٤٧٤٧ واتە: نەکەن گومانی خراپ ببەن! گومانی خراپ درۆترین قسەیە، جاسوسی بەسەر یەکترەوە مەکەن، خۆشتان بە دوی یەکتریدا مەچنەوە،[١] یەکتری مەبوغزێنن و ڕقتان لە یەکتریی نەبێت، ببنە برای یەك، کەستان بەسەر داخوازی براکەیدا نەچێتە پێشەوە، با لێی گەڕێ بزانێت مارەی دەکات، یان وازی لێ دەهێنێت... واتە کە برایەك چوبوە داخوازی ئافرەتێك، با کەسێکی تر لە هەمان کاتدا، کە هێشتا قسەی یەکەم نەبڕاوەتەوە، نەچێتە داخوازی هەمان ئافرەت و قسەی بۆ خۆی تێدا بکات، با ئارام بگرێت داخۆ بە نسیبی ئەو دەبێت، یان وازی لێ دەهێنێت، ئەوسا، با ئەم بچێتە داخوازیی، چ کێشە نیە...

---

١ـ تجسس ئەوەیە کەسی بە دوادا بنێریت، تحسس ئەوەیە کە خۆت بە دویدا بچیت!

ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە باسی ئـەم جـۆرە گومانـەدا لـە ڕاڤـەی فەرمودەکـەدا دەفـەرموێ: گومـان لێـرەدا واتـە تۆمـەتبار کردنێـك، کـە هـیچ بەڵگەیەکی وای بە دەستەوە نەبێت، بۆ نمونە، کەسێك یەکێکی دیکە بـە تۆمـەتی زیناکاریی تاوانبار دەکات و بەڵگەیەکی واشی بە دەستەوە نیەو هیچ ئاسـەوارێکی زیناکەش دەرنەکەوتوە، بۆیە یەکسەر بە دوایـدا فـەرموی، نـە جاسوسـی بکـەن و نەخۆشتان بە دوی موسوڵماندا بچن! بۆ ئەوەی کەسـی لەسـەر نەکاتـە جاسـوس و خۆی هان نەدات، کـە بـە دوای تۆمـەتبار کراوەکـەدا بـڕوات تـا شـتی تـری لـێ دەدۆزێتەوە... ئەم فەرمودەیە هاو ئاڕاستەی ئەو ئایەتەیە کە خوای گـەورە تێیـدا دەفـــــــەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًا﴾ الحجرات / ١٢ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، لە گومانی خراپ زۆر خۆتان بـەدور بگـرن، چـونکە زۆر جـار هەیـە، کـە هەندێك گومان دەبنە تاوان، جاسوسی بەسەر یەکەوە مەکەن و غـەیبەتی یـەکتریش مەکەن...

ئایەت و فەرمودەکە دیارن، کە تا چ ڕادەیەك کەسایەتی موسـوڵمان دەپـارێزن، ناهێڵن لە ناخی مێشکی خۆشیاندا گومانی خراپ بە یەکتریی ببەن! تا ڕێـی ئـەوە بگرێت لە خاوەن گومانەکە و نەڵێ: وەڵا دەمەوێت بکەومە دوای ئـەم مەسـەلەیەو ڕونی کەمەوە، بزانم وایە، یان نا!! ئەمە خۆی بەدودا چونی هەنگاوەکانی شـەیتانە! (فتح الباري ١٠/٤٩٦).

ئایەتەکە لەڕوی دەرونیەوە هەموی وردەکارانە ڕیزبەنـد کـردووە: کەسـێك، کـە گومانی خراپی نەبرد، جاسوسیەکەش ناکات، نە خۆی بەدوی کەسـدا دەچـێت، نـە کەسـیش دەنێرێـت، کـە هیچیـشی لا نـەبوو، غـەیبەتەکـەش ناکـات، بـەڵام بـە پێچەوانەوە ،ئەوی گومانەبەدەکەی بردووە، دەبێتە خولیای سـەری، بزانێـت وایـە،

یان نا، ئینجا شەیتان هانی دەدات بۆ لێکۆڵینەوەو بەدودا چـون، خـۆی سـەرقاڵە، خەڵك دەنێرێت، خەڵك بەکرێ دەگرێت!! بۆچی؟! هەر بۆ ئـەوەی بیـسەلمێنێت، کـە گومانەکەی لە جێـی خۆیـدا بـوە! کـە گومانەکـەی تونـدتر دەبێـت لێـی دەبێتـە بەڵگەنەویست و وا قسەی لەسەر دەکـات، کـە بـواری گومـانی تێـدا نـەمابێت، بەمەش لە خەرمانی خێری خۆیدا غەیبەت بە غەیبەت دادەگیرسێنێت!!

دەرهەق بە سینەپاکیی خوای گەورە موسوڵمانانی فێـر کـردووە، کـە هەمیـشە ئـــەو دوعایـــە بکـــەن: ﴿وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾الحشر/١٠ واتە: خوایە مەهێڵە هیچ جۆرە ڕق و قـین، بـوغزو کینەیـەك لـە دڵمانــدا بەرامبــەر موســوڵمانان بچێنێــت، خوایــە جــەنابت خــاوەن ســۆزیت و بەبەزەییت... پێغەمبەری ڕەحمەتیش ﷺ دەفەرموێ: ((أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَنْ يَحْرُمُ عَلَى النَّـارِ أَوْ بِمَـنْ تَحْـرُمُ عَلَيْـهِ النَّـارُ عَلَـى كُـلِّ قَرِيـبٍ هَـيِّنٍ سَـهْلٍ))ترمـزی/٢٤١٢ دەشفەرموێ حەدیسێکی حەسەن و غەریبە، واتە: ئەرێ هەواڵتان نەدەمێ، کە کـێ لە ئاگری دۆزەخ حەرامە، یان ئاگری دۆزەخ لەکێ حەرامە؟! لەو کەسەی کـە حـازر بەدەست و نەرم و نیان و ئاسانکارە! نابینیت لـە دوعاکـانی خۆشـیدا دەیفـەرمو: (واسْلُلْ سَخِيمَةَ صَدْرِي) ترمزی ٣٤٧٤ واتە: خلتەو خاڵی سینەم ڕادە...

### و ـ دوعا بۆ کردن و شوێن جەنازە کەوتنی:

ئەرکی برایەتی ئیسلامیە، کە موسوڵمان دوعا بۆ برا موسوڵمانەکەی بکـات و داوای خێرو خۆشی دیناو قیامەتی بۆ بکات، هەروەها ئەگـەر کۆچـی دوایـی کـرد لەگەڵ جەنازەکەیدا بچێتە گۆڕستان و دوعای لێبوردنی بۆ بکات... لە فـەرمودەی سەحیحدا هاتوە، کە پێغەمبەری سەروەرمانﷺ دەفەرموێ: ((مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَدْعُو لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ إِلَّا قَالَ الْمَلَكُ وَلَكَ بِمِثْلٍ)) موسـلیم/هــەر عەبـدێکی موسوڵمان لە پشت ملە، دوعا بۆ براکەی خۆی بکات، فریشتەیەکیش بەردەوام لـە

دوایەوە دەڵێتەوە: بۆ تۆش هەروا! خۆ ئەمە شتێك نیە ئەوەندە قورس بێت پێمان نەکرێت، بەڕاستی نابێت موسوڵمان خۆی لەم ئاستەش لە خواروتر ببینێتەوە! پێیوستە هەمیشە دوعای خێر بۆ براکانی بکات، بۆیان لە خوای میهرەبان بپاڕێتەوە، خۆ خوای گەورە وەکو لە فەرمودەکاندا دیمان بەڵێنی داوە، کە مرادی ئەو موسوڵمانەش، کە دوعا بۆ براکانی دەکات حاسڵ کات و هیوایان بێنێتە دی!!

ئەما شوێن کەوتنی جەنازەکەی، ئەوە نیشانەی سیلەی ڕوحم و وەفادارییە، هەست کردنە بە نزیکی، نیشاندانی ڕێزە لەو برایەتیەی، کە وای لێکردبون لە دنیادا پێکەوە بن، بەڵام وا مردن لێکی جودا کردونەتەوە، بەڵام تا ئەو ساتەی لەسەر زەویدا مابێت، جێی ڕێزەو ئەمی موسوڵمان هەر دیدەنی دەکات، تا ئەو ساتەی دەخرێتە گۆڕ!! بە دوی جەنازەدا چون، نوێژ کردنیشی لەگەڵە، کە لەسەر جەنازەکەی دەیکات، کە تکای لە خوای گەورە بۆ دەکات لێی خۆش بێت، ئەمەش بەردەوامی گومان باشی و ڕەحمەت بۆ ناردن و بۆ پاڕانەوەکەی بۆی، کە خوای گەورە لێی ببورێت، لە هەمان کاتیشدا دڵدانەوەی کەسوکاری مردوەکەیە، بەڵێندانی بەردەوام بونی دۆستایەتیەکەیەتی لەگەڵ ئەوانیش، بەشداربونی خەمیانە... ئەمانەش گومانی تێدا نیە، کاریگەریی دەروونیان زۆر گەورەو گرنگە، چونکە ئەوان کۆستیان کەوتوەو لێیان قەوماوەو، کەلێنیان تێ کەوتوە، دڵ بە جۆشن و خەمبارن، چاوەڕوانی کەسێکن دڵنەواییان کات و کۆڵی خەمیان لەسەر سوك کات...

# بەشی سێیەم

## هەڵدێری ڕێی برایەتی[1]

### ١ـ غەیبەت و جاسوسی و دوزمانی و گاڵتە پێکردن و تانەوتەشەر لێدان:

خوای گەورە ڕێی بە غەیبەت کردنی موسوڵمان نەداوەو زۆر بە توندی سەرزەنشتی بکەرەکەی کردووە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾الحجرات/١٢، واتە: غەیبەتی یەکتریی مەکەن، چما کەستان حەز دەکات گۆشتی براکەی بە مردویی بخوات، کە زۆر بێزیشی لێ دەکەنەوە؟! خوای گەورە تۆبەی تۆبەکاران زۆر وەردەگرێت و بەبەزەییە...

غەیبەت ئاشکرایە باس کردنی برا موسوڵمانەکەتە بە دیار نەبونی خۆی، باسی خۆی و هەرچیەك، کە پەیوەندی بەوەوە هەبێت... پێغەمبەری سەروەرمانﷺ فەرموی: ((أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ؟ قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ)) موسلیم/٢٥٨٩ واتە: ئەرێ دەزانن غەیبەت چیە؟! ووتیان: خواو پێغەمبەری خوا دەزانن، فەرموی: باس کردنی براکەتە بەوەی کە پێی ناخۆشە، ووتیان: ئەگەر ئەوەی باسی دەکەین لە براکەماندا هەبوو، فەرموی: ئەگەر تێیدا بوو، ئەوە غەیبەتیتان کردوە، ئەگەر تێیدا نەبوو، ئەوە بوختانتان بۆ هەڵبەستووە! کەوابوو ئەو کەسەی، کە باسی شتێکی برا موسوڵمانەکەی خۆی

---

١ـ زۆرینەی ئەم بەشەمان لە کتێبی الاخلاق الاسلامیەی شێخ عبدالرحمان حەسەن حەبەننەکە المەیدانیەوە وەرگرتووە، خوا پاداشتی خێری بداتەوە ..

دەکات، کە ئەو پێی ناخۆشە باسی بکرێـت، تێیدایـەتی ئـەوە غـەیبـەتی کـردوە، ئەگەر تێیدا نەبوو، ئەوە درۆی بە دەمەوە دروست کردوە، بوختانی بۆ هەڵبەسـتوە، واتە شتێکی داوەتە پاڵی، کە تێیدا نەبوە!

غەیبەت: ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتی زۆر ناشیرینە، لە کەسێك ناوەشێتەوە باوەڕی تەواوی بە خواو بە پێغەمبەری ئیسلامﷺ هێنابێت، بۆیە شتێکی ناشیرینە برایانی ئیمانداریی، بەکتریی دانیشن و باسو زەمی یـەکتریی بکـەن، کـە دەشـزانن خـوای گەورە حەڕامی کردووە، ئاخر ئەمە هەر هیچ نەبێت، جـارێ پێـچەوانەی فـەرمانی خوایەو سەرپێچی ئامۆژگاریەکانی ئەوە! وەرنەگرتنی رەفتارو رەوشتی پێغەمبـەری پێـشەوایەﷺ، رێـز نـەگرتنی برایـەتی دینیـە، شـکاندن و سـوك کردنـی بـرا موسوڵمانەکەتە، کە هەر وەکو تۆ کەسایەتی خۆی هەیەو حەز دەکات بـە پـاکی و سەلامەتی بمێنێت! بۆیە خوای گەورە حەڕامی کـردوەو بـە گۆشـتی بۆگـەنی بـرا مردوەکەتی داناوە، تا بێزت لێی بێتەوەو نەیکەیت، چونکە کردن و بەردەوام بونـت لەسەری، پەیوەندیە ئیمانیەکەی نێوانتـان لاواز دەکـات، متمانـەتان بـە یـەکتریی نامێنێت، ڕق و قین دەکەوێتە نێوانتانەوە، ئەمانەش سەر دەکێـشن بـۆ نـاکۆکی و دوژمنایەتی... چونکە غەیبەت کردن نهـێنی موسـوڵمانان ئاشـکرا دەکـات، تـۆ شتێکی تایبەتی و نهێنی برا موسوڵمانەکەت دەزانی، کە لە ساتێکی ڕق هەسـتان و کزیی باوەڕو تەقواتتدا کەوتیتە زەم کردنی، ئاخر ئەو نهێنیەش دەدرکێنیت، کـە لە غەیری بەتاڵ کردنەوەی ڕقی خۆت، هیچ سودێکی تـری بـۆ کـەس نـەبوو! مـن غەیبـەت بکـەم و تـۆ بکـەیت و ئـەو بیکـات ئـیتر نهـێنی موسـوڵمانان چـۆن دەپارێزرێت؟! دیسان کە تۆ غەیبەتی کابرای موسوڵمانت کـردوو بیـستیەوە، ڕقـت لێ هەڵدەگرێت، بە دوی نهێنیتـدا دێتـەوەو ئاشـکرای دەکـات، ئـێ ئـەو هـەموو موسوڵمانـەش بکەونە کارو کاردانـەو غـەیبـەتی یەکترییـەوە، چـی بـە یـەکترەوە دەهێڵن؟! کۆمەڵگەی موسوڵمانان چەند لاواز دەکەن؟! زمانی خەڵکی دی چەند لـە

خۆیـان دەکەنـەوە؟! ئیـدی تەسـەور کـە لـە مـاوەی سـالێکدا، چ پۆخلـەواتێکی موسوڵمانان دەکەوێتە کۆڕو کۆمەڵـەوە! چـەند بابـەتی میـدیایی لەسـەر کەڵەکـە دەکرێت؟! چەندی تریشی پێوە دەلکێندرێت و دەبێتە ئیدیعایەو قـسەو قـسەلۆك؟! ئینجا چۆن سەر دەکێشێت بۆ کەسایەتیە ئیسلامیە ناودارەکـان و، چـۆن ئـەوانیش بە دەستی موسوڵمانان خۆیان لە ناو کۆمەڵدا سوك دەبن و کاریگەرییان نامێنێت!!

ئێ ئـەم هـەموو درزو کەسـەرە لـە پێنـاوی چـیدایە؟! چ سـودێك و بـە کێـی دەگەیێنێت؟!

مەگەر ئەوپەڕی وێناکردنی حەق نیە، کە خوای حەقناس دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾... چما کەستان حەز دەکات گۆشتی براکەی بە مردویی بخوات؟!!

بڕوانە ئەو وێنا کردنە؟! ئاخر بـە زینـدویی جـائیز نـەبوو قـەپاڵ لـە جەسـتەی براکەت بگریت، بە مردویی چۆن؟! زۆر مردوو شۆر هەن، کە بێز لە هەندێ مـردوو دەکەنەوە، ئیدی ئەو خەڵکە بە گشتی چی؟! واتە چی وای لێ کردوون، کە ئەوەنـدە بوغزاوی بن، بە مردووییش قەپ بە جەستەی براکەتاندا کەن؟! براکەت کـە ئاگـای لێ نەبووە، کە غەیبەتت کردوە، ئاخر ئەمە وەکو ئەوە وایـە قـەپاڵ بـە جەسـتەی مردوویدا کەیت، کە هەستی پێ ناکات! جا کە ئەو ژانی ناگاتێ، تۆ بۆچی ئەوەندە لا ڕێ و موئەریف بوی حەزت لەو بۆگەنییەیە؟!

بەس لەوە بیر کەوە، کە چی دەچێتە سەر لاشەی مردارەوەبوو، دەیخوات؟!

ئەمما جاسوسی کردن لەسەر بـرای موسـوڵمانت! چ خـەڵکی بنێریتـە دویـان، چ خۆت بکەویە دویان، هەر حەرامە، کارێکە لەگەڵ موسوڵمانی دینـدارو بەتـەقوادا نایاتەوە، جاسوسی کردن واتە لەو کاتەی خەڵکانێك لە ئەماندان، لـە جـێ و ڕێـی خۆیـانن و نایانـەوێت کـەس بـە نهێنییـان بزانێـت، یـەکێکی لاڕێ و موخـەریفی لاسەنگ بە ماتە ماتـە خـۆی گەیانـدونێ و تایبەتمەنـدێتی کـۆڕو کۆمەڵـەکانیان دەدزێت!! سەیریان دەکات و ئەوان نایبینن، گوێی لێ گرتون و ئەوان ئاگایـان لێـی نیە، نوسینە تایبەتیەکانیان دەخوێنێتەوەو کۆپی دەکاتەوە، لە کاتێکدا ئەوان لەوە بێ خەمن، کە لە شوێنی ئەمیندا دایانناوەو کەسانی دەوروبەریشیان دەسـتپاکن و جاسوسییان بەسەرەوە ناکەن!!

ئەمـە شـتێکی زۆر ناقۆڵایـە، لـە جـوامێریی و ڕەوشـتی بـەرزی ئیمانـداران ناوەشێتەوە، بۆیە خوای گەورە بەرهەڵستی دیندارانی دەکات، کـە نەکـەن بکەونـە ڕەفتاری واوە! نەکەن جاسوسی لەسەر موسوڵمان بکەن، موسـوڵمان سـەر ڕاسـتەو پابەندە بە ڕێی خوا پەرستی خۆیەوە، ئەگەر هەڵەیەکیشی لێ دەرکەوت، یـان لاواز بوو، پێویستی بە یارمەتی هەستانەوە هەیە، نەك بە سوك کردن و جاسوسی لەسەر کردنی! نابێت موسوڵمان بۆ بەرژەوەندی خۆی یـان سـودی کەسـانی دیکـە ببێتـە جاسوس بەسەر موسوڵمانانەوە، چونکە ئـەو جاسووسـی کردنـەی لەوانەیـە ببێتـە مایەی پیلان دانانێکی دیکە دژی ئیسلام و موسوڵمانان! هەزاران کـەس هـەن بـە گێلێتی بەکار دەهێنرێن بـۆ زانـینی نهـێنی ڕیـزی موسـوڵمانان و، ئـەمانیش بـە ساویلکەیی دەکەونە جاسوسی کردن، بێ ئەوەی بە شتێکی گەورەی بزانن!!

خوای گەورە ئەو مافەی بە هەموو کەس داوە لە ئەماندا بێت، لە جـێ و ڕێـی خۆیدا هەست بەوە بکات، کە چاوی کەسی بەسەرەوە نیە، بۆیـە جاسوسـی حـەرام کردوە، خەڵك بە گشتی و موسوڵمان بە تایبەتی، مافی خۆیـەتی ئەگـەر کەوتیـشە

گوناحەوە بە نهێنی بمێنێتەوەو خەڵکێك لێی نەکەنە هەرا! خوای گەورە پێی خۆشە موسوڵمانان (غەیری دەسەڵاتدارانی شەرعی) عەیب و عاری کابرای گوناحکار داپۆشن، نەك ئابڕوی ببەن کەن! کۆمەڵگە موسوڵمانەکە مافی ئەوەی هەیە نەهێڵێت خەڵکی لاوازو بێ تەربێت، یاساو ڕێسا شەرعیەکان بە ئاشکرا پێشێل کەن، بۆیان هەیە شکاتیان لێ کەن، نەك خۆیان لە خۆیانەوە جاسوسییان لەسەر بکەن![1]

دەفەرموێ: جاسوسی مەکەن، نە خۆتان، نەکەس بکەن بە جاسوس بەسەر کەسی دیکەوە، بۆ ئەوەی کۆمەڵگەکە ئەمانی نیشتەجێیی لە دەست نەچێت! تا دانیشتوانی وڵاتەکە هەست بەوە نەکەن، کە هەمیشە چاودێریان وا بەسەرەوەو هەر ئەمڕۆنا سبەی دەبرێنە بەر داداگا، چونکە لەڕەفتاری بەدگومان بون!!

ئەو کۆمەڵگەیەی ئەو هەموو جاسوس و موخابەرات وئەمنەی تێدا بڵاو دەبێتەوە، پڕ لە قین و بوغزو ملشکاندنی یەکتریی، ئەوە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نامێنێت، دەبێتە ئاغەڵ و پەچەی ئاژەڵ و جێ شەڕە شۆق و دەگەو کەتن لە یەکتریی...

---

١ـ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ خەلیفەش بوو، کە هەواڵیان دایێ، کە کەسێك وا لە ماڵەکەی خۆیدا شەراب دەخواتەوە، بەسەر دیواردا بازی داو گرتی و پێی ووت: هەی زاڵمی نەفسی خۆت، ئەوە بۆچی لە خوا ناترسیت ؟ کابرا پێی ووت: سەبر کە، من یەك تاوانم کردووە، تۆ سێ تاوانت لەسەر یەك کردوە، لە مافی کەس نیە موراقەبەی ناو ماڵی خەڵکی تر بکات تۆ کردوتە، کەس نابێت بێ مۆڵەتی خاوەن ماڵ بچێتە ماڵی کەس، تۆ بازت بەسەر دیواری ماڵمدا داوە، خوای گەورە دەفەرموێ: نەچنە ماڵی کەس تاس سڵاوی لێ دەکەن و ڕێتان دەدات، تۆ سڵاویشت نەکردوەو بە زۆر هاتویە ماڵم!! عومەر گوتی: ڕاست دەکەیت، بەڵام بەڵێنم بدەرێ نەخۆیتەوە، کابرا ووتی: ئەوە نێوان خۆم و خوایە!!

ئەمە عومەرە، کە خەلیفەشە! ئەو مافە بە خۆی، نادات ڕایکێشتە دادگای شەرعی وسزای بدات!

بەڵام دوو زمانی، کە بریتیە لە قسە هێنـان و بـردن لـە نێـوانی دوو لایەنـدا، بۆناکۆکی و فیتنەسازیی و بەشەڕ دانیان، دوو لایەنەکە ژن و مێردێك بن، یـان دوو هاوڕێ، یان دوو تیرەو هۆز، یان دوو کۆمەڵ، یان دوو میللـەت، یـان دوو دەوڵـەت هەر یەکە...

دووزمانی، پیسترین شێوازی شەیتانیە بۆ ئاژاوە نانەوەی نێـوان دوو لایەنـەکان! بۆیە ئەوی دەیکاتە پیشەی خـۆی، شـایانی ئـەو هەڕەشـە سـەختەی پێغەمبـەری ڕەحمەتەﷺ، کە دەفەرموێ: ((لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ نَمَّامٌ)) موسلیم / ١٥١ واتـە: ئـەوی دووزمانە ناچێتە بەهەشتەوە!! بیر کەرەوە، کابرای موسوڵمان کە ئەم ڕەفتارە بـەدە دەکاتە پیشەی خۆی، جگە لە زیانی دنیایی، کە لێـی دەکـەوێت، ببینـە چـۆن لـە بەهەشتی خوایی بێبەش دەبێت!! خوا لاماندا لە ڕەفتاری وا شەیتانی...

بەڵام گاڵتە پێکردن و تانەو تەشەر لێدان: ئەوەیە، کە کەسێك بە تەوسـەوە بـە مانایەکی شاراوە توانج و پەلار لە براکـەی بـدات، سـەرزارەکی قـسەکە جـۆرێکی شیاو بێت و مانا شاراوەکەی شتێکی سـوکایەتی بێـت، وشـە و ڕسـتەی وا هەیـە شاراوەکەی کاریگەرترە لە ئاشـکراکەی، بۆیـە زامـی قـوڵتر لـە دەرونـدا دروسـت دەکات، چونکە مانای گێلـێتی و هێـرێتی بەرامبەرەکـە دەگـەیێنێت، هـەر وەکـو ئەوەی توانجگرەکە کۆڕو کۆمەڵەکە تێگەیێنێت، کە بەرامبـەرەکەی گێلەو ئەقڵی بەو قسانە ناشکێت، کە پێی دەڵێ.

تانەو توانج گرتن، ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتی تری ناشیرینە، کە دەبێتە مایەی ڕق لێبونەوەو قین هەڵگرتن و بوغزاندن، ئەوەش سەر دەکێشێت بۆ لاواز کردنی متمانە بە یەك کردن و باریك کردنەوەی پەیوەندی برایەتی، چونکە ئەمـە هەسـت برینـدار کردنـە، دەسـتدرێژی کردنـە سـەر مـاف وسـنور بەزاندنـە، بۆیـە خـوای گـەورە بەرهەڵستی لێ کردوە، کە دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾الحجـرات/١١ واتـە: تیرو توانج مەگرنە یەکتریی و یەکتریی سوك مەکەن... بڕوانە تـیرو تـوانج گـرتن و

سوکایەتیەکەی وا باس فەرموە، وەکو ئەوەی کابرای تیرو توانج وەشێن، تیرەکەی گرتبێتەوە خۆی! چونکە کۆمەڵگەی موسوڵمانان، کە لەسەر برایەتی دینیی دامەزراوە، یەك لاشەیە... یەك دیواری خشتی خشتە!

گاڵتە پێکردنیش هەر وایە... پێچەوانەی ڕەوشتی بەرزی دیندارانە، ستەم و دەستدرێژیەکی ترە، کە کەسێك دەیکاتە سەر کەسێکی دیکە، هەست بریندار کردن و سنور بەزاندنی کەسانی ترە، دڵ ئێشاندنێتی، سەرەنجامی ئەمیش گومانی تێدا نیە، لێك زویر بون و متمانە نەمانە بە یەك، بەردەوامبونیشی سەر دەکێشێت بۆ بوغزاندن و دژایەتی کردن، ئەمەش شیرازە پسانی کۆمەڵایەتی ئیسلامی پێوەیە، کە لەسەر بناغەی ڕێزو خۆشەویستی دروست بووە! گاڵتە پێکردن، حەتمەن هەستی برایەتیەکە لاواز دەکات و وا لە بەرامبەرەکە دەکات، ئەویش بگەڕێت خاڵی لاواز لە گاڵتەچیەکەدا بدۆزێتەوەو گاڵتەی پێ بکاتەوە... مەرجیش نیە هەردولایان، هەر ئەو خاڵانە بەکار بێنن، کە تێیاندا هەیە! چونکە گاڵتە کردنەکە سەر دەکێشێت بۆ ناهەقی، وەکو گاڵتە کردن بە سیماو سیفاتی کەسەکان، بە کەسوکاریان، بە ڕەوت و ڕێبازیان!! ئەوەش مایەی قبووڵ کردن نیە... بۆیە هەر لایەنەو لە چۆنیەتی تۆڵە سەندنەوە دەگەڕێت!! لەبەر ئەمانەیە، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّ﴾الحجرات/١١ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، نەکات کۆمەڵێك گاڵتە بە کۆمەڵێکی دیکە بکات! لەوانەیە کۆمەڵەکە (گاڵتە پێکراوەکە) باشتر بێت لەوان (لە گاڵتەکارەکە) هەروەها ژنانیش، با گاڵتە بە ژنانێکی دیکە نەکەن، کە لەوانەیە ئەوان لەمان باشتر بن...

گاڵتە پێکردن جۆرێکە لە سوك کردنی بەرامبەرەکەی، کە لەوانەیە لە بوغز و حەسادەتی گاڵتەکارەکەوە هاتبێت، لەبەر ئەوەی هەستی کردوە، کە دەرەقەتی

نایەت ئیتر پەنای بردۆتە بەر گاڵتە پێکردنی! هەر چیەك بێت... بۆ موسوڵمان شیاو نیە گاڵتە بە موسوڵمانی تر بکات، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ وای داناوە، کە هەر ئەوەندە کۆڵە گوناح بەسە بۆ کابرایەکی موسوڵمان کە گاڵتە بە موسوڵمانێکی دیکە بکات، بە سوکی تەماشای کات، وەك دەفەرموێ: ((بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْتَقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ)) ترمزی/۱۸۵۰ دەشفەرموێت: حەدیسێکی حەسەنە...

ئەمانەی باسکران هەندێکن لەو ڕەفتارە دزێوانەی بە بون و تەشەنە کردنیان، دەبنە نەریتێکی بەدو نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی سەخت، کە حەتمەن ئاسەواری خراپی لێ دەکەوێتەوە... بۆیە موسوڵمانان دەبێت سور بن لەسەر ئەوەی خۆی بە ڕەوشت بەرزیەکەی ئیسلامەوە پابەند کەن و نەهێڵن نەفسیەتیان لاسەنگ ببێت... بەوەش برایەتی خۆیان دەپارێزن و خوای خۆشیان لە خۆیان ڕازی دەکەن...

## ۲ ـ گڕی تورەیی و بەغیلی خەرمانی برایەتی دەسوتێنێت:

تورەیی: کڵپەگڕێکەو ئاگر لە برایەتیەکە بەر دەدا، ساتە غەفڵەتێکە، کە جڵەوی نەفس دەخاتە دەست شەیتان! بۆیە لە هەڵچونی توورەییدا مرۆڤ شەیتانانە ڕەفتار دەکات! بۆیە پێغەمبەری پێشەوامانﷺ، کە کابرایەك هاتە خزمەتی و داوای لێ کرد، کە ئامۆژگاریەکی بکات، پێی فەرموو: (لَا تَغْضَبْ) واتە تورە مەبە، ئەو هەر ووتیەوە ئامۆژگاریم بکە، پێغەمبەریشﷺ هەر دەیفەرموو: ((لَا تَغْضَبْ)) بوخاری/۵٦٥۱...

توورەبون بریتیە لە پەرەسەندنی تینی خوێن و ورووژانی غیرەت بۆ تۆڵە سەندنەوە... ئیبنو قودامەی مەقدیسی دەڵێ: هەر کاتێك، کە گڕی تورەبون پەرە بستێنێت، ئەوە بەرچاوی خاوەنەکەی تاریك دەکات و ناهێڵێت ڕاستی ببینێت، کەڕی دەکات و ناهێڵێت هیچ ئامۆژگاریەك ببیستێت! چونکە شاڵاوی تورەیی

سەردەکەوێتە سەر مێشك و هەموو دەزگاکانی بیرو ژیریی دەوەستێنێت و، بینایی سواغ دەدات!! (مختصر منهاج القاصدين (١٧٩))... لە بەرامبەر هەڵچونی توڕەییدا، خوای گەورە مەدحی ئەو کەسانەی کردوە، کە لەو ساتە وەختانەدا خۆ کۆنترۆڵ دەکەن و ڕقەکەی خۆیان قوت دەدەنەوە، بۆیە دەرهەقیان فەرمویەتی: ﴿وَٱلۡكَـٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾ آل عمران / ١٣٤ واتە لەوانەی سوپاسکراون ئەو کەسانەن، کە توڕەییەکەی خۆیان کپ دەکەنەوەو دەری نابڕن... پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (( مَنْ كَظَمَ غَيْظًا وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ دَعَاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ اللَّهُ مِنْ الْحُورِ الْعِينِ مَا شَاءَ )) ئەبوداود/سەحیحە /٤١٤٧، واتە: هەر کەسێك، کە توڕەبوو، دەیتوانی توڕەبونەکەی بەسەر کەسێکدا بڕێژێتو نەیکرد، لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لە ناو هەر هەمو خەڵکیدا بانگی دەکات و پێی دەفەرموێ: ئەوە حۆری، کامیانت دەوێت هەڵیبژێرە...

بەغیلی و حەسادەتیش هەر وایە، لە خراپترین سەرپێچی فەرمانی خوایە، لەبەر ئەوەی بەرهەمی زۆر دژوارو مەترسیداری لێ دەکەوێتەوەو، ڕەوشت لاسەنگ دەکات بە خراپتر لەو گوناحانە ژمێرراوە، کە بە ئەندامانی لەش دەکرێن!! هۆکاری بەغیلی و حەسادەت بە خەڵك بردن ـ دوای ئیمان لاوازیی بە خوای گەورە ـ خۆویستی و خۆپەسەندییە... بێ ئەدەبیە بەرامبەر بە خوای گەورە، چونکە بەغیلی بردن بە خەڵکی، واتە ڕەخنە گرتن لە چۆنیەتی بەشکردنی خوایی! بۆیە هەبون و بەردەوامبونی، زیان بە خودی باوەڕ دەگەیێنێت!!!

بەغیلی و حەسادەت لە ناو گەل و میللەتاندا کۆنە، دەگەڕێتەوە سەر قابیلی کوڕی ئادەم، کە لە حەسادەتدا براکەی خۆی کوشت! لە ناو زۆر میللەتیشدا ببوە سیمای پەیوەندی کۆمەڵایەتی!! وەکو کە پێغەمبەری پێشەوامان ئاماژەی

پێکردووە: ((دَبَّ إِلَيْكُمْ دَاءُ الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ الْحَسَدُ وَالْبَغْضَاءُ هِيَ الْحَالِقَةُ لَا أَقُولُ تَحْلِقُ الشَّعَرَ وَلَكِنْ تَحْلِقُ الدِّينَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَفَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِمَا يُثَبِّتُ ذَاكُمْ لَكُمْ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ))ترمزی/سەحیحە ٢٤٣٤ واتە: نەخۆشی و درمی میللەتانی پێش خۆتانتان بەناودا بڵاو بۆوە: بەغیلی و بوغزنی! ئەمانە تاشەرن! ناڵێم موو دەکەن، بەڵکو دین دادەتاشن! سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ناچنە بەهەشتەوە، تا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیشتان نابێت، تا یەکتریتان خۆش نەوێت! شتێکتان پێ نەڵێم، کە ئەگەر کردتان ئەوەتان لا بچەسپێنێت، لە ناو خۆتاندا تەشەنە بە سڵاوکردن بکەن...

پێغەمبەری پەروەردەکار بەرهەڵستی کردووە، کە دڵی موسوڵمان بەغیلی و حەسادەتی تێ کەوێت! لە فەرمودەی سەحیحدا دەفەرموێ: ((وَلَا تَحَاسَدُوا وَلَا تَدَابَرُوا وَلَا تَبَاغَضُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا)) بوخاری /٥٦٠٤ واتە: بەغیلی و حەسادەت بە یەکتریی مەبەن، پشت لە یەکتریی هەڵ مەکەن (لە یەکتریی زویر مەبن) بوغز بەرامبەر بە یەك هەڵ مەگرن، ببنە بەندەی خوای گەورەو برای یەك...

بەغیلی و حەسادەت، هیچ دۆستایەتیەك و متمانەو خۆشەویستیەکی نێوان موسوڵمانان ناهێڵێت، شیرازەی خزمایەتی دەپسێنێت، دوژمنداریێتی دەنێتەوە، ڕق و قین زیاتر دەکات، کۆمەڵی موسوڵمانان لێك دور دەخاتەوەو پەرتەوازەیان دەکات... بەغیلی و حەسادەت بردن وەکو مقەستە! هەر دەڕوات و پەیوەندی نێوان خەڵکی باش دەپسێنێ و، شاپڵێتەیەکی فیتنەسازیی لە جێی دادەنێت!! وەك میکرۆبی ئایدز، سێڵە چاکەکە دەفەوتێنێت و لە شوێنی ئەو، ڤایرۆسی ئەو نەخۆشیە دژوارە دادەنێت!! خوا لامانـدا... ئاخر بۆیە ڕێساکانی پەروەردەی

ئیسلامی هەمیشە جەخت لەوە دەکەنەوە، کە تەلاری کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەر برایەتیەکی پاك و بێ غەل و غەش نەبێت دانامەزرێت، مەحاڵە کیانی ئیسلامی، کە یەك جەستەیە، لەسەر کۆمەڵێك کەسی بەغیل و حەسودو ڕقن دابمەزرێت، با موسوڵمانیش بن!!

## ٣ـ قین و دوژمنکاریی:

قین: واتە گیردان و پەنگ پێخواردنەوەی ڕق و بوغز لە سینەدا، لەبەر ئەوەی لە بێ تواناییدا نەتوانراوە دەربرڕێت، بۆیە خاوەنەکەی لە هەل دەگەڕێت، تا بە شێوەیەك لە شێوەکانی ڕشتن بە بەرامبەرەکەی بڕێژێت! شێخ عبدالرحمن حەسەن حەبەننەکە المیدانی لە پێناسەیدا دەڵێ: (قین: دوژمنداریێتی پەنهانی دڵە، دوژمنداریێتیش بوغزاندنێکە، کە چاوەڕوانی هەلی تۆڵە دەکات لەو کەسەی بوغزێنراوە، جاری وا هەیە دەگاتە ئەوەی خاوەن قینەکە دەیەوێت بوغزێنراوەکە هەر مەفح کاتەوەو نەیهێڵێت!

لە وشە بەرامبەرەکانیشی: الغِلُّ: کە هەر لە دڵدایە، بەڵام لە قین زیاتر ڕۆچووە... الشُّحناء و الضَغِينَة: هەر لە تەوەری دوژمنداریێتیدان... (الاخلاق الاسلامیة ١/٨٧٥).

شەرعی خوا زۆر بە توندی بەرهەڵستی لە قین وبوغز کردوە... پێغەمبەری بەڕێزﷺ دەفەرموێ: ((لَا تَبَاغَضُوا وَلَا تَحَاسَدُوا وَلَا تَدَابَرُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثٍ)) بوخاری / ٥٦٠٥ واتە: یەکتری مەبوغزێنن، بەغیلی و حەسادەت بە یەکتریی مەبەن، پشت لە یەکتریی هەڵ مەکەن (لە یەکتریی زویر مەبن) بوغز بەرامبەر بە یەك هەڵ مەگرن، ببنە بەندەی خوای گەورەو برای یەك، هیچ موسوڵمانێك بۆی نیە لە سێ شەو زیاتر دەنگ لە براکەی دابڕێت و لێی زویر ببێت . ئەمە دەقێکی ڕۆشن و ڕاشکاوە، کە بە هیچ

شێوەیەك ڕێ نادات لە نێوان موسوڵماناندا قین و بوغزو زویر بون، ببێتە ڕەفتاری موسوڵمان، نکوڵی لە هەبونی ناکات، بەڵام ناهێڵێت لە سیفەتی کاتێتی دەرچێت!!

هەروەها دەفەرموێ: ((تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلَّا رَجُلًا كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ فَيُقَالُ أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا))موسلیم/٢ ٤٦٥ واتە: دەروازەکانی بەهەشت لە ڕۆژانی دووشەممە و ڕۆژانی پێنج شەمماندا دەکرێنەوە، لەو ڕۆژانەدا لە هەموو عەبدێکی خوا خۆش دەبێت، کە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار نەدابێت! مەگەر کەسێك کە نێوان خۆی و براکەی ناکۆکیەکی تێ کەوتبێت، ئەوجا بانگ دەکرێت: چاوەڕێ بن (جاریٚ دەروازەکان دامەخەنەوە) تا ئەو دوانەش پێك دێنەوە، چاوەڕوێ بن تا پێك دێنەوە، چاوەڕێ بن تا پێك دێنەوە!!

## ٤ ـ لوت بەرزیی و هەڕاڵی و بەخۆ سەرسام بون:

لوت بەرزی ئەوەیە، کە کابرا ئەوەندە بە خۆی سەرسام دەبێت، کە بەرامبەرەکانی بە کەمتر لە خۆی دەبینێت، بۆ تێر کردنی هەواو هەوەسی مونحەریفی، حەز دەکات ئەوان لە ناو خەڵکیدا بە کەم باس کرێن، تا ئەم گەورەو گرنگ دەرکەوێت! یەکێك لە زەقترین سیمای لوت بەرز ئەوەیە، کە کەللە ڕەقی دەکات وسورە لەسەر ڕای خۆی، جاری وا هەیە ڕاستی وەکو ڕۆژ بۆی دەردەکەوێت، بەڵام هەر نکوڵی لێ دەکات، خوا لاماندا!! گەر دەستی بڕوات هەمیشە حەق پێشێل دەکات! لەبەر لاسەنگی ئەم جۆرە کەسانەیە، کە لە قورئان و فەرمودەی پێغەمبەریﷺ سەروەرماندا هەڕەشەی زۆر لەخاوەنی ئەم سیفەتە ناقۆڵایە کراوە، چونکە تەشەنە کردنی لە ناو خەڵکیدا ئاسەواری کۆمەڵایەتی وێرانکارییانە دەخاتەوە، ئەو کەسەی بەم سیفەتە فیرعەونیە گرفتار دەبێت، هەر وەکو

فیرعەونیش زیانی بۆ خۆی و دەوروبەرو کۆمەڵگەکەش هەیە، ئیتر بە گوێرەی بازنەی دەسەڵاتی خۆی... ئەمە لە ناو خەڵکیدا بە گشتی، ئەمما دەرکەوتنی لە ناو موسوڵماناندا هەر زۆر دژوارە! چونکە چینایەتیەکی ئاڵۆزو نابەجێی دەرونی دەخولقێنێت! کاریگەریی برایەتیە دینیەکە دەپوکێنێتەوەو دادی یەکسانی موسوڵمانان ناهێڵێت، ئەمە جگە لەوەی،کە بەدڵنیاییەوە کابرای لوت بەرز خۆی و دەوروبەری زوو بە فەتارەت دەبات، چونکە خوای گەورە بە هیچ شێوەیەك ئەوە لە کافریش قبوڵ ناکات، چ جای موسوڵمان! نابینیت، کە خوای گەورە باسی ئاسەواری خەتەری لوت بەرزی و تەکەببوری قارون دەکات، کە بە دەوڵەمەندی و دەسەڵات هەراڵ بو بوو، کە بە گوفتارو رەفتاری ئەوەندە بوغرا بو بوو چاوی زەوی نەدەدی! چ زیانێکی لە خۆی و ماڵ ومنداڵ و دەوروبەرو پارەو سامانەکەشی دا، کە لە دەرهەقیدا دەفەرموێ: ﴿ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ ﴾ القصص/٨١ واتە: خۆی و کۆشك و تەلاریشیمان بە زەویدا ڕۆ برد، کۆمەڵێکی نەبوو، کە پشتی بگرن و نەهێڵن خواوای لێ نەکات! نەشچوە ڕیزی سەرکەوتوانەوە! چونکە خوای گەورە ڕێسایەکی بۆ هەراڵ و خۆبەزلزانان داناوە کە وەکو ڕێسای گەردوونیەو ناگۆڕێت: ﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴾غافر/٣٥ واتە: ئە ئاوا مۆر بە دڵی هەموو لوت بەرزێکی هەراڵ و بە هێزو دەسەڵاتدا دەنێین... خۆ بە گەورە زانین و خاوەن دەسەڵاتێتی مافی خوایەو، نابێت بەندەیەکی بێهێزو پێز وا لە خۆی بگۆڕێت و وا بزانێت شتە!! ئەوە بێ ئەدەبی و سنور بەزاندنێکی خەتەرە، بۆیە پێغەمبەری نازدارﷺ دەرهەقی دەفەرموێ: ((لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ قَالَ رَجُلٌ إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنَةً قَالَ إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ)) موسلیم/١٣١واتە: ئەوی مسقالە زەرەیەك (بە قەدەر

گەردیلەیەکی تۆز کە لەبەر تیشکی رۆژ لە پەنجەرەیەکەوە دەردەکەوێت) تەکـەبوری لەدڵدا بێت، ناچێتە بەهەشـتەوە! کابرایـەك پرسـی: باشـە کەسـێك حـەز دەکـات پۆشاکی بەری جوان و ڕازاوە بێت، پێڵاوی پێی جوان بێـت؟! پێغەمبـەر فـەرموی: خوا جوانەو جوانیشی پێ خۆشە، بەڵام تەکەبور بریتیە لە حەق پێشێل کردن و گوێ نەدان بە مافی خەڵکی...

لە لوت بەرزیەوە جۆرەها نەخۆشی دیکەی دەرونـی و ڕەفتـاری خـوارو خـێچ و نەریتی کۆمەڵایەتی خراپ دەکەوێتەوە، چونکە لوت بەرز مافێك، کە دڵنیایە لێـی هی خەڵکێکی ترە، نایانداتێ و دەیکات بەژێر لێوەوە، دان بە مافێکدا ناهێنێـت، کە هی خەڵکانێکی ترە! کە هەقێك کەوتە سەری، ملی بۆ نادات و پێی وایە ئـەوە خۆ بچووك کردنەوەیە لەبەر دەستی کەسانێکی تـردا، کـە شـیاوی ئـەوە نـین ئـەم هەڵوێستی وایان بەرامبەر بنوێنێت!! لوت بەرز، چونکە شـەیتان فـوی بـە لوتیـدا کردووە، نایەوێت کەس لە ئاستی ئەودا بێت، چ جای ئـەوەی سـەروی کـەون! ئـەو کاتانەی، کە دەسەڵاتی ڕێگرتنیانی نیەو دەبینێت کەسانێکی دیکە پێشی کـەوتون دەیەوێت ناویان بزرێنێت و ئیدیعایەیان دەخاتـە دوا، کـە شـایانی ئـەوە نـین، یـان زەمانە بردونیەتە پێش! دەنا ئەم سەد قات لەو شایانترە!! ئینجـا دەکەوێتـە زەم و غـەیبەتیان، بەو هیوا چووکاوەی لەبەرچاوی خەڵکیان بخات!!

ئەمما هەڕاڵ بون و بە خۆ سەرسام بون: ئەوەیە، کە کابرا خۆی وا دەبینیـت، کـە لە ڕیزی پیاوماقوڵان و ناوداراندایە، نابینیت چ سیفەتێکی گرنگـی تێدایـە؟!! لـە هەر کۆڕو کۆمەڵێك هەر قسەیەك بکرێت، ئـەمیش قـسەیەکی تێـدا دەکـات، تـا بزانن لەوەش دەزانێت! باس لە هەر کەسێك دەکەن، ئەمیش سیفەتێکی خۆی، یـان هەڵوێستێکی خۆی، یان هەر نەبێ نەبێ ڕایەکی خۆی نیـشان دەدات، تـا بزانرێـت ئەمیش پێیەتی! هەمیشە پێی وایە ئەوانەی دەوروبەری نزمن، کـەمترن، بەقـەدەر

ئەمی لێنازانن!! لە کاتێکدا واش نیە، ئەمانە هەر وەهمن، خەیاڵ پڵاون، لە دنیای واقیعدا، یان نین، یان ئەوەندە نین، کە کابرای سەرسام خۆیان پێوە با دەدات!

ئەگەر ئەم سیفەتە توشی موسوڵمان بێت ـ پەنا بەخوا ـ زۆر کاریگەریی سلبی لەسەر دینداریتیەکەی دروست دەکات! چونکە لە خۆدیتنیدا کەسی دیکە نابینێت، ئیدی تەنازول بۆ کەس ناکات، ئەو حەقەی لای خەڵکیە، وەری ناگرێت! بەمەش دەکەوێتە تاوانی گەورەوە... جاری وا هەیە لەبەر ئەوەی پەی بە حەقەکە نەبردووە، کە لای خەڵکێکی سادەی بێ هەواو فیزەو ئەم پلەو مەکانەتی، یان سومعەو ناوەکەی، نایهێنێت قبووڵ کات، کە لەو کەسە سادەوە شتێك وەرگرێت، بۆیە لەسەر هەڵوێستێکی باتڵی خۆی سور دەبێت و ئەو حەقە ڕونە وەرناگرێت، ئەمەش زۆرتر وا لە ناو مەلاو زاناو داعیەکاندا هەیە، ئیمامی غەزالی دەفەرموێ: (بە خۆ سەرسام بون کۆتا شتە لەسەری زاناکان دێتە دەرەوە)!!

بەخۆسەرسام بون زۆرتر فوو لە غروری خاوەنەکەی دەکات! تا پێی وا دەبێت، هەر خۆی بونی هەیە، ئیدی بە کۆسپێکی وایدا دەدات، بە یەکجاری دەیتەقێنێت، چونکە بەخۆسەرسام بون، بە هەموو پێوەرێك ناهەقییە، پێچەوانەی ڕێسای سروشتیە، پێچەوانەی ئاڕاستەی خواییە، پێچەوانەی پارسەنگیە... بۆیە مەحاڵە هەر وا بە ئاسان بۆ کەس بچێتە سەر...

## ٥ـ نەخۆشی تر کە کاریگەریی لەسەر کەمتەرخەمی برایەتی دینیی زۆرە:

جگە لەم نەخۆشیە دەرونیانەی باسمان کرد بە دڵنیاییەوە نەخۆشی تر زۆرن، کە توشی هەر کەسێك ببن، لاسەنگی دەکەن و دیدی لێڵ دەکەن، سەرەنجامیش برایەتیە دینیەکەی نێوان موسوڵمانانیشی پێ لاواز دەبێت... لەوانە: دەنگ لێك دابڕین، توندو سەختگیریی، فزولێتی و خۆ لە شت هەڵقورتاندن، غیرەو غەدر،

گومان خراپی، دوودڵی و ڕاڕایی، خۆشحاڵ بون بە بەڵاو موسەیبەتی خەڵکی، زیـان لە خەڵك دان، فرۆشتن بە سەر فرۆشتندا، داخوازی بەسەر داخوازیدا... هتد.

ئەمانـە هــەموی دەبنــە هۆكـاری لاواز بــونی گیــانی برایـەتی و، نەهێـشتنی متمانەی كۆمەڵكاریی و بە هەدەردانی وزەی موسوڵمانان... خوای گەورە دەســتی پێمانەوە بێت و نەمانداتە بەر هەواو هەوەسی خۆمان... ئامین

# بەشی چوارەم

## چەند نموونەیەکی کردەوەیی

مێژوو هەزاران هەڵوێستی نمونـەیی بـۆ تۆمـار کـردوین، بـە ملیـۆن لاپـەڕەی پڕشنگداریی مێژوی ئوممەتەکەمانی پاراسـتووە، کـە پـڕن لـە وێنـەی درەوشـاوەی برایـەتی دیـنی... نەخـشێنەرە پاڵەوانـەکانی هـەمووی یـاوەرانی پێغەمبـەری نازدارنﷺ، یان شوێن کەوتوەکانی ئـەوان، یـان ئەوانـەی بـە دوایانـدا هـاتن لـە فەرماندەو خواناسان لە زانایان و شەرعناسان لە پیاوچاکانی دیکە... چ ئوممـەتێك هەیە لەسەر زەمیندا تا پێنج سەد ساڵ لەمەوبەری مێژوی ژیانی پێنج سەد هـەزار کەسی خۆی نوسیبێتەوە؟! ئەم ئوممەتەی ئێمە مێژوی ژیـانی پێـنج سـەدو سـێزدە هەزار زاناو فەرماندەو ناوداری خۆی نوسیوەتەوە، کە هـەر هـەمویان لـە کـات و شوێنی خۆیاندا سەرمەشقی دەوروبەریان بون!!

ئەگەر بگەڕێین نمونە بهێنینەوە بۆ هەر نەوەیەك و لە هەر شارێکی گـەورەو لـە هەر پۆلێك، ناودار یێك بنووسین، دەبێت چەندین بەرگ کتێب بنوسین، بەڵام با لـەو ڕوەی، کە مشتێك نمونەی خەروارێکە، چەند نموونەیەك بهێنینەوە:[1]

---

١ـ کێبێکی جوانی شێخ مستەفا سیباعی (رحمە اللە) هەیە بە ناوی(من روائع حضارتنا) نموونەی جوانی وای تێدایە، لەویش زۆرتر کتێبی(قصص العرب)ی محمد احمد جاد المولی و هاوەڵانێتی، کە چوار بەرگی گەورەیە...

* ئەبو بوردە لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری ڕێزدارﷺ لە مەتحی ئەشعەرییەکاندا[1] فەرموی: (إِنَّ الْأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِي الْغَزْوِ أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ بِالْمَدِينَةِ جَمَعُوا مَا كَانَ عِنْدَهُمْ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُمْ فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ بِالسَّوِيَّةِ فَهُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ))بوخاری/٣٩٠٦ واتە: ئەشعەریەکان لە غەزادا، کە خۆراکیان نە دەما، یان کەم دەبۆوە، خۆراکی ماڵەکانی خۆیان دەهێناو هەمویان لە پۆشاکێکدا تێکەڵ یەك دەکردو، پاشان بە یەکسانی بەسەر یەکدا بەشیان دەکردەوە! ئەوانە لە منن و منیش لەوانم! سەیری ئەم کارە پەسەندەو ئەو خۆشنودیەی پێغەمبەری سەرکردەﷺ لێیان! پاشان ئەو ڕێزە: (ئەوانە لە منن و منیش لەوانم) خۆزگە بە خۆیان.

* عائیزی کوڕی عەمر گوتی: (ئەبو سوفیان بە لای سەلمان و سوهەیب و بیلالدا(خوا لێیان ڕازی بێت) تێپەڕی، کە بینیان وتیان :، شمشێری خوا لە خوێنی گەردنی ئەم دوژمنەی خوا تێراو نەبوو (یەعنی حەیفیٚ نەکوژرا) ئەبو بەکری سددیق (خوا لێی ڕازی بێت)، کە بیستیەوە گلەیی لیٚ کردن، گوتی وا بە گەورەی قوڕەیش دەڵێن؟! پاشان هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و باسەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری بەزەییﷺ فەرموی: ((لَعَلَّكَ أَغْضَبْتَهُمْ لَئِنْ كُنْتَ أَغْضَبْتَهُمْ لَقَدْ أَغْضَبْتَ رَبَّكَ)) موسلیم: ٤٥٥٩ واتە: نەکا تورەت کردبن، چونکە ئەگەر تورەیان بکەیت، بە دڵنیاییە خوای خۆتت تورە کردوە لە خۆت!!

سەیری ئەم چیرۆکە بکە... ئەو سیٚ بەڕێزە لەوانە بون، کە کڕراون و فرۆشراونەتەوە! ئەو قسەیەی، کە کردیشیان وە نەبێت لە دژی دینیی خوا کردبێتیان، وەنەبێت بۆ ڕەزامەندی دوژمنانی خوا بوبێت، وەنەبێت لەبەر هەواو

---

١ـ ئەشعەرییەکان لە هۆزی حیمیەری یەمەنی بون و وەفدیان دەهاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ، کە یاوەری بەڕێز ئەبو موسای ئەشعەری خوا لێی ڕازی بێت لەوانە...

هەوەسی خۆیان بوبێت، یان لەوەی مافیان لای ئەبو سوفیانەو تۆڵەی خۆیان لێ نەکردۆتەوە، بەڵکو لەبەر ئەو هەموو هەڵوێستە دوژمنکارانەی لە ماوەی بیست ساڵی ڕەبەقدا بەرامبەر بە دینیی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ کردی، ئەوەندە لای خوا بەڕێزن، کە ئەگەر تورە کرێن، خوا بە توندی لەسەریان هەڵدەداتێ و لەبەر ئەوان تورە دەبێت!!

ئینجا سەیری ئەم زەمانەی ئێمە، کە ئەو سەلمان و سوهەیب و بیلال ئاسایانەی زەمانی خۆمان، کە چ چەوساوەن؟! لە کوێن؟! یان لە زینداتن لەژێر قامچی جەللادانداندان، یان ئەوەندە موستەزعەف کراون شەوو ڕۆژ بە دووی نانی هەژاریی و داماویاندان، لەگەڵ ئەو حاڵەشیاندا دەزگایەکی ڕاگەیاندن نامێنێت قسەیان پێ نەڵێت!!! کافرو فەرماسۆنو زەندیقێك نامێنێت جنێویان پێ نەدات!! بە جۆرەها ناووناتۆرە ناوزەدیان دەکەن: بە کۆنەپەرست، بە تیرۆریست، بە توندڕەو بە نەفام و گێل، بە پیاوانی چەرخی بەرد! وەکو بەرزەکی بانانیش بۆی دەردەچن!! ئاوا دەبینیت رۆژانە مەتح و سەنای کافرو مولحیدو بێ دینان دەکرێت و دیندارانیش زەوی نەماوە لە خۆیان بگرێت؟! ولا حول ولا قوة الا بالله.

* ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە، کە سەلکە مەڕێکیان بە دیاری هێنا بۆ یاوەرێکی دەسکورتی پێغەمبەرﷺ، وەری نەگرت، گوتی: بیبەن بۆ فلاَن کەس لە من پێویسترە، بردیان بۆی، ئەویش وەری نەگرت، گوتی بیبەن بۆ فلاَن کەس ئەو لە من لە پێشترە! بردیان بۆ سێیەمیش، ئەویش وەری نەگرت و ووتی: لە من ئاتاجتر(موحتاجتر) هەیە بیبەن بۆ فلاَن کەس... ئا بەو شێوەیە بردیان بۆ حەوت ماڵ، دوایی هەر هاتەوە سەر کەسی یەکەم، کە لە هەموان موحتاجتر بوو!! ئەو ئایەتەی قورئان لەسەر ئەوە دابەزی کە

دەفـــــــەرموێ:﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ الحشر/۹ واتە: واتە ئەگەر هەژاریش بەسـەر خۆیاندا بهێنن هەر کەسانی تر دەخەنە پێش خۆیان!! هەر کەس لە تین و تـەوژمی پیسکەیی و بەخیلیی دەروونی خۆی قوتار بوبێت، بەڕاسـتی ئەوانـە سـەرفرازن... حاکم گێڕاویێتیەوەو فەرموویەتی سەحیحە (٥٢٦/٢) ئیبنوحەجـەری عەسـقەلانیش لە فەتحدا(١٢٠/٧) ئاماژەی وای بۆ کردوە...

* ئیبنو شەبرمە، کە یەکێك بوو لـە یـاوەرانی پێغەمبـەرﷺ زۆر بـە تـەنگ براکانیەوە دەبوو، کاری زۆری بۆ دەکـردن، جارێـك کەسـێك دیاریـەکی بـۆ هێنـا، ئیبنو شەبرمە گوتی: ئەمە چیە؟ کابرا ووتی: دیاریەکەو بۆم هێناویت، تۆ چـاکەی زۆرت لەگەڵدا کردوم و لە کاری منـدا زۆر مانـدوو بویـت، گـوتی: دیـاری خـۆت هەڵگرەوە خوا بتبەخشێ، هەر کاتێك بە برایەکت ووت کارێکت بۆ بکـات، ئەگـەر دەیتوانی و هەوڵی نەدا بیکات، دەسنوێژێك وەکو بۆ نوێـژ دەگریـت بیگـرەو چـوار تەکبیرەی نوێژی جەنازەی لەسەر کەو بیخە ڕیزی مردوانەوە!!

بەڵێ چـونکە ئیمانـدارێتی بـە برایەتیـەوە جوانـە، کۆمەڵگـەی ئیـسلامی بـە برایەتیە دینیەکەیەوە بەهێزە...

نموونەی برایەتی دامەزراو لە مێژوی ئیسلامدا بە تایبەتی لە ڕیزی یاوەران و تابعیندا ناژمێررێت، چونکە پێشینەی ساڵحی ئەم ئوممەتە، هەموو ساتێکی ژیانیان کردبوە ئاسەوارێکی ئەو برایەتیە دینیە، یەکتریان خۆش دەویست، بە تەنگ یەکترەوە بون، هۆشیان لای یەکتریی بوو، سەردانی یەکترییان دەکرد، بەرژەوەندی یەکترییان دەخستە پێش بەرژەوەندی خۆیانەوە، بەرامبەر بە یەکتریی بێ هەواو فیز بون، لەسەر ڕەفتارناسییەك پەروەردە بوبون، کە لە تەزکیەی

دەرونیەوە هاتبوو، کە قورئان و فەرمودە بە پارسەنگی دایانڕشتبوو، هەموویان نەرم و نیان بون لەگەڵ یەکتریی و توندوتیژ بون بەرامبەر بە دوژمنانی خوا... مەگەر خوای گەورە لەبەر ئەو سیفەتە بەرزانەیان نەبوە، کە دەرهەقیان فەرمویەتی خوا لێیان ڕازیەو ئەوانیش لەخوا ڕازین!!! ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ﴾التوبە/١٠٠واتە: (پۆلی یەکەمینی ئیمانداران، کە یەکەمین جار باوەڕیان هێنا لەکۆچەریەکان و پشتیوانەکان و لەوانەش، کە جیددی و پیاوچاکانە شوێنیان کەوتون، ئەوانە خوا لێیان ڕازیەو ئەوانیش لە خوا ڕازین!! دەی خوایە ئێمەش هەرچەندە شایانی ئەو ڕێزە نین، بەڵام وا پیاوچاکانە شوێنیان کەوتوین، خوایە بمانخەیتە ڕیزیان...) ئامین...

دەی سا پیاوانی ئوممەتی موسوڵمان، لاوانی ئیسلام، وەرن با پەیمانێك بە خوای خۆمان ببەستین و بکەوینەوە خۆسازدان، تا شیاوی ئەوە دەبین بچینە ڕیزی ئەو خواناسانەوە، کە خوا لێیان ڕازی بوو... وەرن با ورەو وزەمان بکەینەوە یەك، ئێمە زۆرمان پێ دەکرێت، بەڵام شل و شێواوین، ورە روخاوین، دوورترین ڕێ بە یەکەم هەنگاو دەست پێ دەکات، ئەو هەنگاوەش ئەمڕۆ بینێین باشترە لە سبەی...

## برای دیندارم

برای دیندارم کوا زات وغیرەت کوا هەست و هۆش و حەماس و سیرەت

کـە تـۆ لە خەمی دنیاوە ئالاّی کـێ بێتـــە خەمخۆری دیـن و ئـــالاّی

برام کـوا ئەو غیرەتی هەتبـوو کـــە دیتـت ئومـــەتت وا لــەت بـــوو

خـۆ تۆ دینداری بە هێزتر بووی دە کـــوا ئەو هەستەی هەناسـەت بوو

برای دینــداری چالاك و چوست ســوور بە لەســەر هەڵوێستی دروســت

گـەر ئازادە یـان لە زینــــدان سـوورە لەسـەر رێگـەی، خـواویسـت

برای دینــدارم گـەر سـەبرت بێ کـــاروانــی دینــداری رێ دەبـــــڕێ

نەکـەی لە هیـچ مەنزڵێ لادەی هــەتـــا ســـایـــەی خیـلافــەت دێ

# لیستی ئایەتەکان

## ئایەت

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾ الحجرات / ١٠

﴿ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾ التوبه/٧١

﴿ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ ﴾ ال عمران / ١٠٣

﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ الحشر/٩

﴿ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴾ البقره/٨٣

﴿ وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ الحج / ٢٤

﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴾ الاسراء/ ٥٣

﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴾ النساء/ ٨٦

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ﴾ الفتح /٢٩

( وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ) الشعراء/٢١٥

﴿ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ المائده /٥٤

﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴾ النساء/٨٥

﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ العصر/١-٣

﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ﴾ المائده/٢

(وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ) الانفال/٧٢

﴿لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ﴾ البقره/١٧٧

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ النور/٢٤

﴿وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ الحشر/١٠

﴿وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ﴾ الحجرات/١٢

﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ الحجرات/١١

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ الحجرات/١١

﴿فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ يَنصُرُونَهُۥ﴾ القصص/٨١

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ التوبه/١٠٠

# لیستی فەرمودەکان

- (مَثَلُ المؤمنينَ في تَوادِّهِم وتراحُمِهم... ) بوخاری/ ٥٥٥٢، موسلیم / ٤٦٨٥
- (أَنَّ رَجُلًا زَارَ أَخًا لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى... ) موسلیم/ ٤٦٥٦
- (وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ... ) ئیمامی ئەحمەد/سەحیحە(٢٠٩٩٥)ە
- (إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلَالِي) موسلیم/
- (قَالَ سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمْ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ) بوخاری/٦٣٥
- (إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ لَأُنَاسًا مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءَ... ) ئەبو داوود (٣٠٦٠)
- (مَنْ أَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ... ) ترمزی/٢٤٤٥
- (ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ)متفق عليه (بوخاری ١٥ وموسلیم ٦٠)
- (لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ) متفق عليه (بوخاری ١٢ و موسلیم ٦٤)
- (لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا) موسلیم/ ٨١
- (أحِبُّوا مَا أَحَبَ اللهُ، أحِبُّوا اللهَ مِنْ كُلِّ قُلُوبِكُمْ... . ) ابن هشام /٣/٣٠
- (.. أَنِّي أُحِبُّكَ فِي اللَّهِ... ) رواه أبو داود (٤٤٦٠) وأحمد (١٣٠٤٥٦) بسند صحيح
- (تَصَافَحُوا يَذْهَبْ الْغِلُّ وَتَهَادَوْا تَحَابُّوا وَتَذْهَبْ الشَّحْنَاءُ) رواه مالك (١٤١٣) وهو حسن
- (لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا... ) رواه احمد ومسلم وابو داود والترمذي وابن ماجة
- (مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ... ) موسلیم (٣٢٥٣)

ـ (أَعْطِيهَا بَعِيرًا فَقَالَتْ أَنَا أُعْطِي تِلْكَ الْيَهُودِيَّةَ فَغَضِبَ... ) أبو داود (٣٩٨٦) وهو حسن

ـ (كَمْ مِنْ جَارٍ مُتَعَلِّقٌ بِجَارِهِ يَومَ الْقِيامَةِ..) بوخاری له ادب المفرد/حەسەنە/ ١٩٩

ـ (أَرَادَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُقْطِعَ مِنْ الْبَحْرَيْنِ... ) بوخاری/٢٢٠٣

ـ (آخَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنِي وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ) بوخاری/١٩٠٧

ـ (وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ) بوخاری/٢٧٦٧

ـ (ثَلاثٌ يُصَفِّينَ لَكَ وُدَّ أخِيكَ: تُسَلِّمُ عَلَيهِ إذا لَقِيتَهُ... ) حاكم/حەسەنە/٥٨١٥

ـ (لا تَحْقِرَنَّ مِنْ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ) موسلیم/٤٧٦٠

ـ (لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا... ) موسلیم/٨١

ـ (مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ...... ) موسلیم/٤٦٨٩

ـ (إن اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لَا يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ... ) ئەبو داود/حەسەنە/ ٤٢٥٠

ـ (أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا) ترمزی / حەسەن و سەحیحە / ١٠٨٢

ـ (مَنْ عَادَ مَرِيضًا أَوْ زَارَ أَخًا لَهُ فِي اللَّهِ نَادَاهُ مُنَادٍ... .) ترمزی/حەسەنە/١٩٣١

ـ (..اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا وَيَقْضِي اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَاشَاءَ)بوخاری/ ١٣٤٢

ـ (بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ... ) بوخاری/٥٥

ـ (الدِّينُ النَّصِيحَةُ قُلْنَا لِمَنْ قَالَ لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ) موسلیم/ ٨٢

ـ (وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ) موسلیم / ٤٠٢٣

ـ (الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ) بوخاری/ ٢٢٦٦

- (السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ... ) بوخاری / ٤٩٣٤
- (وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ) موسلیم/٤٨٦٧
- (تكون النبوة فيكم ما شاء الله أن تكون) ئەحمەد/ ئەلبانی لە سلسلة الصحيحة / ٥/١
- (مَا مِنْ امْرِئٍ يَخْذُلُ امْرَأً مُسْلِمًا...... ) ئەبوداوود/ ٤٢٤٠ و ئەحمەد / ١٥٧٧٣
- (الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ وَمَنْ كَانَ فِي الْقِيَامَةِ) بوخاری/ ٢٢٦٢
- (أعِينوا المظلومَ) ئەحمەد/١٨٥٦٩
- (انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا... ) بوخاری/ ٢٢٦٤
- (الْمُؤْمِنُونَ تتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ... ) ئەننەسائی /سەحیحە / ٤٦٥٣
- (فُكُوا الْعَانِيَ وَأَطْعِمُوا الْجَائِعَ وَعُودُوا الْمَرِيضَ) بوخاری / ٢٨١٩
- (تَصَافَحُوا يَذْهَبْ الْغِلُّ وَتَهَادَوْا تَحَابُّوا..) ئیمامی مالیك/سەنەدەکەی حەسەنە/٤٦١٤١٣
- (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا) بوخاری ٢٣٩٦
- (حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ... ) بوخاری / ١١٦٤
- (من ستر مسلماً ستره الله يوم القيامة) موسلیم / ٤٦٧٧
- (إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيث... ) بوخاری/٤٧٤٧
- (أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَنْ يَحْرُمُ عَلَى النَّارِ أَوْ بِمَنْ تَحْرُمُ عَلَيْهِ النَّارُ... ) ترمزی/٢٤١٢
- (مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَدْعُو لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ إِلَّا قَالَ الْمَلَكُ وَلَكَ بِمِثْلٍ) موسلیم / ٥٣
- (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ نَمَّامٌ) موسلیم / ١٥١

- (بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنْ الشَّرِّ أَنْ يَحْتَقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ) ترمزی / ١٨٥٠
- (لَا تَغْضَبْ) بوخاری / ٥٦٥١
- (مَنْ كَظَمَ غَيْظًا وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ... ) ئەبو داوود / سەحیحە /٤١٤٧
- (دَبَّ إِلَيْكُمْ دَاءُ الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ الْحَسَدُ وَالْبَغْضَاءُ...... ) ترمزی / سەحیحە ٢٤٣٤
- (وَلَا تَحَاسَدُوا وَلَا تَدَابَرُوا وَلَا تَبَاغَضُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا) بوخاری /٥٦٠٤
- (لَا تَبَاغَضُوا وَلَا تَحَاسَدُوا وَلَا تَدَابَرُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا... .) بوخاری / ٥٦٠٥
- (تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ... ) موسلیم / ٤٦٥٢
- (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ... ) موسلیم / ١٣١
- (إِنَّ الْأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِي الْغَزْوِ أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ... .) بوخاری / ٣٩٠٦
- (لَعَلَّكَ أَغْضَبْتَهُمْ لَئِنْ كُنْتَ أَغْضَبْتَهُمْ لَقَدْ أَغْضَبْتَ رَبَّكَ) موسلیم: ٤٥٥٩

# ناوەڕۆك

